

چاپی پێنجەم

ئینگلیزی - کوردی

# جوانترین وتە

دەربارەی

دایک — سەرکەوتن

ژیان — میهرەبانی

هاوڕێیەتی — بەختەوەری

لێبوردەیی — متمانە

ئەوین — زانایی

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

کارزان نوری عوسمان

# جوانترین وته

دەربارەی

ژیـــان ،

دایك ، هاوڕێیەتی ،

لێبوردەیی ، ئەوین ، سەرکەوتن ،

میهربانی ، بەختەوەری ، متمانە ،

زانـــایی

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

کارزان نوری عوسمان

## ناسنامەی کتێب

کتێب : جوانترین وتە

ئامادەکردن و وەرگێڕانی : کارزان نوری عوسمان

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

تایپ :

نەخشەسازی و بەرگ : کۆمپیوتەری هیوا

نۆرەی چاپ : چاپی دووەم / هەولێر – ٢٠١١

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی گشتی (٢٤٢٤)ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە

جوانترین وته ... جوانترین وته ... جوانترین وته ... جوانترین وته ... جوانترین وته

## پێشکەشە بە:

ڕۆحی پاکی باوکم.

دایکی شیرینم.

هەموو خوشك و براو هاوڕێیان و کەسانی دڵسۆزم.

ئەوکەسانەی شەیدای جوانی و میهرەبانین.

لەگەڵ ڕێزو سوپاسم بۆ هاوڕێی خۆشەویستم

کاکە (بێستون نزار)

# پێشەکی چاپی دووەم

خوێنەری ئازیز دوای ئەو پێشوازیە گەرمەی لە چاپی یەکەمی ئەم پەرتوکە کرا بریارم دا چاپی دووەمی بکەمەوەو زیادەشی بخەمە سەرو ئەو کەم و کوریانەش چاك بکەم کە لە چاپی یەکەمی هەبوون بۆ زیاتر سوود گەیاندن بە نێوەی خۆشەویست. ئەم پەرتوکە هەڵقەڵاوی بیری سەرکردەو زانا و بیرمەندانی مێژووی مرۆڤایەتیە، خۆشتان ئەزانن کاری وەرگێران کارێکی ئاسان نیە بە تایبەتیش وەرگێرانی وتەی بیرمەندانی جیهانی چونکە هەریەك لەم بیرمەندانە چەندین ماناو مەبەستی شاراوەیان لە پاڵ وتەکانیان هەیە، بۆیە من هەوڵمداوە بە جانترین شێوە دارشتن بۆ ئەم وتە بە پێزانە بکەم، هەڵبەتە ئەمە مانای ئەوە نیە کە بێ کەم و کوریە بەڵکو کەم و کوری زۆریشی تیایە بۆیە بە پێویستی دەزانم بە رەخنەکانتان دەوڵمەندمان بکەن و هەمیشەش رەخنەکانتان هەوێنی سەرکەوتنەکانی ئێمەن. قسەکردن لە بارەی ئەم چەمکانەی لەم پەرتوکە باسی لێوە کراوە بە کتێبێك و دوو کتێب و چەندین کتێب

کۆتایی نایەت بەلام هیچ نەبێت هەوڵێکی بچوکە بۆ دەرخستنی گرنگی ئەم چەمکانە. بۆیە ئەڵێم با بە جوانی لە ژیان بڕوانین، بە سۆزێکی دایکانەوە لەگەڵ بەرامبەرەکەمان هەڵس و کەوت بکەین، بە گیانێکی لێبوردەوە بەرەو ڕووی مرۆڤەکان بڕۆین، بە عەشقەوە خۆشەویستی بکەین، هەنگاو بەرەو سەرکەوتن بنێین، بە زانایی بەختەوەری بەدەست بێنین، بە متمانەوە قۆناغەکانی ژیان ببڕین. لە کۆتایی دا هیوام وایە ئەم وتانە تەنیا دروشمێك نەبێت بۆ خۆدەرخستن و قسەی زل بەڵکو با ڕەنگدانەوەی لە ژیانی کرداری هەریەك لە ئێمە هەبێت.

بچوکتان

کارزان نوری عوسمان

٢٠١١/١/٦

# پێشەکی چاپی یەکەم

ڕابردوو بوو بە مێژوو سبەینێش ئایندەیە ، ئەم ساتە وەختەی تیایدا دەژی هەوڵبدە بیسازێنی بەپەندی مێژوو بەکاری ئەمڕۆ بۆ ئایندەیەکی پڕشنگدارتر و دونیا بینیەکی فراوانتر .

مرۆڤ دروستکراوێکی کۆمەڵایەتی یە بەو واتایەی ناتوانێت بە تەنها بژیت ،پێویستی بە هاوکاری و هەماهەنگی کەسانی دەوروبەری هەیە ،لێرەدا گەورەیی ئەم وشانە دەردەکەوێت وەك ژیان ، سەرکەوتن ، زانایی ، بەختەوەری ، متمانە ، دایك ، هاوڕێیەتی ، ئەوین ، میهرەبانی و لێبوردەیی ، چونکە لە ژیاندا پێویست بوونی مرۆڤ بەیەکتر دەردەکەوێ .

ئەم پەرتووکەی وا لە خزمەتتاندایە باس لە ژیان بە مانا فروانەکەی دەکات و تایبەت نیە بە چینێك بەڵکو بۆ هەموانە بۆ گەنج ولاو پیرو جەوان بۆ ژن و پیاو بۆ هەموو مرۆڤێکی ناخ زیندو تا بتوانێ لەم وشانە تێ بگات و لە ژیانی ڕۆژانەی پەیڕەویان بکات .

ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین زۆر پێویستمان بە بەها جوانەکان هەیە، وە زۆریش پێویستە ئەو بەها

جوانانە لە خودی خۆمان بەدی بهێنین تا ڕێزگرو و ڕێز لێگیراو بین، هەر بۆیە دەڵێم ژیان جوانە تا مرۆڤەکان ژیان ویست بن و هەوڵبدەن بۆ سەرکەوتن لە قۆناغەکانی ژیان، سەرکەوتن لە ژیانی هاوسەری لە بەدەستهێنانی دڵەکان وە سەرکەوتنیش پەیوەستە بە وردبوونەوەی زانایانە ، زانایانە بیر بکەینەوە زانایانە تێفکرین زانایانە خۆشەویستی بکەین تا بەختەوەربین ، بەختەوەریش بە ڕێزگرتن و متمانە بەخشینی نێوان کەسەکانە .دایك چەندە پیرۆزە ئەوەندەش بە سۆزە ،دایك ژیانە سەرچاوەی خۆشبەختی مرۆڤەکان لە ڕەزابوونی دایکە ، بەدەستهێنانی سەرفرازی هەردوو دنیایە ، ئەوین لەم ڕۆژگارەدا پێویست و پیرۆزەو پێویستە لە نێوان زیندو نازیندو ڕەش و سپی گەورەو بچووك هەبێت چونکە ژیان بە ئەوینەوە جوانە ، میهرەبانی گەورەییە بۆ خاوەنەکەی چەندە میهرەبانبین ئەوەندەش سەرکەوتووین بەختەوەرین ، لە جەنجاڵی ژیان لێبوردە سەرفرازە چونکە بە لێبوردەیی ئێمە دەتوانین بژین. .

بەڵی پەرتوکێك بەم قەبارەیە ئەستەمە بتوانێت مافی ئەم وشە ناوازوو بە بەهایانە بدات ، بەلاّم هەبوونەکەی باشترە بەلکو هەنگاوی تری بەدواوەبێت،

لەبەر ئەوەی وشە لە هەموو شتێك بە بەهاترە هەر وشەیە دڵ خۆش دەكات هەر وشەشە نێوانی دڵەكان لێك دەكات ، بۆیە پێم خۆشە كۆتایی ئەم پێشەكیە بەم وتەیە بهێنم ( تەمەن بای ئەوەی نیە خۆشەویستی تیا دەربڕین چۆن جێگای ڕق و كینەی تیا دەبێتەوە ) وە بۆ ئەوەی خۆشەویست بین بۆ ئەوەی یەك ویست بین پێویستە ڕێز لەم چەمكانە بگرین .

كارزان نوری عوسمان

٢٠١٠/١٠/١٠

When life give you a hundred reasons to cry, show life that you have a thousand reasons to smile.

کاتێ ژیان سەد هۆکارت دەداتێ بۆ گریان, هەزار هۆکار پیشانی ژیان بدە بۆ پێکەنین.

"نەزانراو"

"When you make a mistake, there are only three things you should ever do about it: admit it, learn from it, and do not repeat it.

کاتێ هەڵەیەك دەكەی تەنیا سێ شت هەیە پێویستە بیانکەی: دانیپێدانێ , لێوەی فێربە, دووبارەی نەکەیتەوە.

"پۆڵ برایانت"

Never tell your problems to anyone... 20% don't care and the other 80% are glad you have them.

هەرگیز کێشەکانت بە کەس مەڵێ, لە سەدا بیستیان گرنگی پێنادەن و لە سەدا هەشتاش خۆشحاڵن کە کێشەت هەیە.

"لۆو هۆڵتز"

Forgive your enemies, but never, never forget their names.

لە دوژمنەکانت خۆشبە بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ناوەکانیان لە بیر مەکە.

"جۆن کەنەدی"

"When one door closes, another opens; but we often look so long and so regretfully upon the closed door that we do not see the one that has opened for us."

کاتێ کە دەرگایەك بەڕووت دادەخرێ, دەرگایەکی تر دەکرێتەوە, بەلاَم ئێمە هەمیشە سەیری دەرگا داخراوەکە دەکەین و ئاخی بۆ هەڵدەکێشین و ئەو دەرگایە نابینین کە بە ڕووماندا کراوەتەوە.

"ئەلیکساندەر گراهام بیڵ"

Never regret something that made you smile.

هەرگیز لە شتێك پەشیمان مەبە کە وای لێکردی پێبکەنی.

"نەزانراو"

"You can close your eyes to things you don't want to see, but you can't close your heart to the things you don't want to feel."

دەتوانی چاوت بەڕووی ئەو شتانەدا داخەی کە ناتەوێ بیانبینی, بەڵام ناتوانی دڵت بەڕووی ئەو شتانەدا داخەی کە ناتەوێ هەستیان پێبکەی.

"نەزانراو"

Being ignorant is not so much a shame, as being unwilling to learn.

نەزانین هێندەی ئەوە شەرم و عەیب نیە کە ویستی فێربوونمان نەبێت.

"بنجامین فرانكلین"

Never allow someone to be your priority while you're just their option.

هەرگیز رێگە نەدەی بەوەی کەسێك ببێتە کەسی یەکەمی تۆ لە کاتێکدا تۆ تەنیا یەکێکی لە هەڵبژاردنەکانی. ( کەسێ مەکە بە خۆشەویستی خۆت کە تۆ خۆشەویستی دووەمی ئەو بیت).

"نەزانراو"

I hope life isn't a big joke, because I don't get it.

هیوام وایە ژیان نوکتەیەك نەبێت, چونکە من لێی تێناگەم.

"جاك هاندی"

I have a simple philosophy: Fill what's empty. Empty what's full. Scratch where it itches.

فەلسەفەیەکی سادەم هەیە: پڕکردنی ئەوەی بەتاڵە، بەتاڵ کردنی ئەوەی کە پڕە. ڕوشاندنی ئەو شوێنەی کە دەخورێ.

"ئەلیس لۆنگواس"

Life is like a shadow, when you are in light everything will follow you, but when you enter dark even your shadow will leave you.

ژیان وەك سێبەر وایە ، کاتێك لە رووناکی دای هەموو شت بەدوات دەکەوێ ،بەڵام کاتێ دەکەویە ناو تاریکیەوە هەتا سێبەرەکەشت جێتدەهێڵێ...

"نەزانراو"

"Anything in life worth having is worth working for."

هەر شتێك لە ژیان شایەنی ئەوە بێت کە هەتبێت، شایەنی ئەوەشە کار بۆ بەدەست هێنانی بکەیت.

"ئەندۆ کارنگی"

It is not death that a man should fear, but he should fear never beginning to live."

ئەوەی پێویستە مرۆڤ لێی بترسێت مردن نیە، بەڵکو پێویستە مرۆڤ لەوە بترسێت هەرگیز دەست بە ژیان نەکات.

"مارکۆس ئۆریلیۆس"

"Never wish life were easier, wish that you were better."

هەرگیز ئاوات مەخوازە ژیان ئاسانتر بوایە, ئاوات بخوازە کە تۆ باشتر بویتایە.

"جیم ڕۆن"

Remember the past, plan for the future, but live for today, because yesterday is gone and tomorrow may never come.

رابردووت لە بیر بێ و پلانت بۆ داهاتوو هەبێ, بەلاَم بۆ ئەمڕۆت بژی, چونکە دوێنێ ڕۆیی و بەیانیش لەوانەیە هەرگیز نەیەت.

"لۆک"

Never forget what a person says to you when they are angry."

هەرگیز ئەو شتە لەبیر مەکە کە کەسێك لە کاتی تورەبوندا پێت دەڵێ.

"هێنری بیچەر"

It's time to move forward. The past is history. You can gain more from the future if you just walk to its direction. The past is dead; the future is life, so go with it.

کاتی ئەوەیە بەرەو پێش هەنگاو بنێی، رابردوو بوو بە مێژوو. لە داهاتوو دەتوانی زیاتر بەدەست بێنی ئەگەر بۆ ئاراستەیەکی ڕاست بڕۆی، رابردوو مرد: داهاتوو ژیانە بۆیە لە گەڵی برۆ.

"نەزانراو"

Dream as if you'll live forever, live as if you'll die today.

خەون بەوە ببینە هەروەك ئەوەی تا هەتایە دەژی, بژی وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەمری.

"جەیمس دین"

Be nice to people on your way up because you meet them on your way down."

لەگەڵ خەڵك باش بە كاتێ بەرەو سەر دەڕۆی چونكە لەڕێگای هاتنە خوارەوەت چاوت پێیاندەكەوێتەوە.

"ویلسۆن میزنەر"

Those who can't change their minds can't change anything.

ئەوانەی ناتوانن بیركردنەوەیان بگۆڕن ناتوانن هیچ شتێك بگۆڕن.

"بیرنارد شۆ"

"When you want to say goodbye, look back and remember how hard it was to say hello."

کاتێک دەتەوێت بڵێیت ماڵئاوا، رابردووت لەبیر بێت قورس بوو بڵێت سڵاو.

"تیفانی ویلیام"

Learn from yesterday, live for today, hope for tomorrow. The important thing is not to stop questioning.

پەند لە دوێنێ وەرگرە و بۆ ئەمڕۆ بژی و هیوات بە بەیانی هەبێ. گرنگترین شت ئەوەیە لە پرسیارکردن نەوەستی.

"ئەنیشتاین"

Life is just a mirror, and what you see out there, you must first see inside of you.

ژیان ئاوێنەیەکە, هەر شتێك کە لە دەرەوە دەیبینی سەرەتا دەبێ لە ناخی خۆت بیبینی.

"والی ئامۆس"

The best things in ,life are unseen, that why we close our eyes when we kiss, cry, and dream.

باشترین شتەکانی ژیان نەبینراون هەر لەبەر ئەوەشە لە کاتی ماچکردن و گریان و خەو بینین چاوەکانمان دادەخەین.

"نەزانراو"

Thou shouldn't eat to live; not live to eat.

تۆ نابێ بخۆی بۆ ئەوەی بژی، ناشبێ بژی بۆ ئەوەی بخۆی.

"سوقرات"

I would rather have people think I'm stupid, and shock them, than have people think I'm smart, and disappoint them."

باشتر وایە خەڵك بە گەوجم تێبگەن و تووشی شۆکیان بکەم، لەوەی بە داناو زیرەکم تێبگەن و تووشی بێ ئومێدیان بکەم.

"مایك برۆنسن"

What does not destroy me, makes me strong.

ئەوەی تێکم نەشکێنێت, بەهێزم دەکات.

"نیچە"

I like to pretend that everything's alright. Because when everybody else thinks you're fine, sometimes you forget for a while that you're not.

حەزدەکەم خۆم وا نیشاندەم کەوا هەموو شتێ باشە, چونکە کاتێ هەموو کەس وا دەزانێ تۆ باشی, زۆر کات بۆ ماوەیەك لە بیر دەکەی کە تۆ باش نیت.

"نەزانراو"

I am the author of my life.
Unfortunately I'm writing in pen
and I can't erase my mistakes...

من نووسەری ژیانی خۆمم ، زۆر بەداخەوەش بە قەلەم

جاف دەنوسم و ناتوانم هەڵەکانم ڕەش بکەمەوە.

"نەزانراو"

Sometimes you have to smile...
Pretend everything's okay.
Hold back the tears,
And just walk away.

هەندێ کات پێویستە پێبکەنی...

وانیشاندەی کەوا هەموو شت باشە,

فرمێسکەکانت بشاریتەوە و

خەمەکانت وەلا نێیت.

"ناوپۆ"

Once you get what you want,
You've got something to lose.

کاتێ ئەو شتەت بە دەست هێنا کە دەتەوێ

شتێکت هەیە بۆ ئەوەی لە دەستی بدەی.

"نەزانراو"

"Be careful ...the ones that make you smile are the same ones that can shatter your heart."

ئاگادار بە... ئەو کەسەی بە پێکەنینت دێنێ هەمان ئەو

کەسەیە کە دەتوانی دڵت تێکبشکێنێ.

"برێنت"

The two hardest things to say in life :
Are hello for the first time
and goodbye for the last

قورسترین دوو شت له ژیان:

سلاو کردن بۆ یەکەم جارو ماڵئاوایی بۆ دواین جار.

"نێرین"

To realize the value of four years: Ask a graduate.

بۆ زانینی گرنگی چوار ساڵ: له قوتابیەکی دەرچووی زانکۆ بپرسه.

"نەزانراو"

My advice to you is getting married: if you find a good wife you'll be happy; if not, you'll become a philosopher.

ئامۆژگـــاریم ئەوەیـــە هاوســـەرگیری بکـــەی, ئەگـــەر هاوسـەرێکی باشـت دۆزیـەوە تـۆ دڵخـۆش ئـەبی, بـەڵام ئەگەر نەتدۆزیەوە ئەوا دەبی بە فەیلەسوف.

"سوقرات"

To realize the value of a mother :
Ask someone who doesn't have one.

بۆ زانینی گرنگی دایك
لە کەسێ بپرسە کە دایکی نیە

"نەزانراو"

To realize The value of one year:
Ask a student who Has failed a final exam.

بۆ زانینی گرنگی یەك ساڵ:

لە قوتابیەك بپرسە کە لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ کەوتووە.

"نەزانراو"

To realize The value of one week:
Ask an editor of a weekly newspaper.

بۆ زانینی گرنگی یەك هەفتە:

پرسیار لە سەرنوسەری رۆژنامەیەکی هەفتانە بکە.

"نەزانراو"

To realize the value of one hour :
Ask the lovers who are waiting to meet.

بۆ زانینی گرنگی یەك سەعات:

پرسیار لە دوو خۆشەویست بکە کە چاوەڕێی ژوانن.

"نەزانراو"

To realize the value of one minute:
Ask a person
who has missed the train, bus or plane.

بۆ زانینی گرنگی یەك دەقە:

لە کەسێك بپرسە کە لە پاس یان شەمەندەفەر یان

فرۆکە بەجێماوە.

"نەزانراو"

To realize the value of one-second: Ask a person who has survived an accident.

بۆ زانینی گرنگی یەك چرکە:

لە کەسێك بپرسە کە لە کارەساتێك رزگاری بووە.

"نەزانراو"

To realize the value of one millisecond :

Ask the person who has won a silver medal in the Olympics.

بۆ زانینی گرنگی کەمتر لە چرکەیەك:

لە کەسێك بپرسە کە مەدالیای سیلڤەری بردۆتەوە لە ئۆلۆمپیاد.

"نەزانراو"

Mirror Is My Best Friend, Because When I Cry It Never Laughs

ئاوێنە باشترین هاوڕێمە چونکە کاتێ من دەگریم ئەو هەرگیز پێناکەنێت.

"نەزانراو"

"It isn't what you have, or who you are, or where you are, or what you are doing that makes you happy or unhappy. It is what you think about."

بەختەوەربوونت یان نەبونت لەسەر ئەوە نەوەستاوە کە چیت هەیە یاخود تۆ کێی یان لە کوێی یا چی دەکەی، ئەوەیە کە تۆ بیر لە چی دەکەیەوە.

"دیل کارنگی"

Life is like writing with a pen. You can cross out your past but you can't erase it.

ژیان وەك نووسین بە قەلەم جاف وایە, دەتوانی خەت بەسەر رابردووت بێنی بەلاَم ناتوانی رەشی بکەیتەوە.

"نەزانراو"

"Believing everyone is dangerous but believing no one is more dangerous"

باوەڕ کردن بە هەموو کەس مەترسیدارە بەلاَم باوەر نەکردن بە کەس مەترسیدارترە.

"ئەبراهام لینکۆلن"

It takes a second to make a mistake, but a lifetime to try and forget it was your fault.

ئەنجامدانی هەڵەیەك تەنیا یەك چرکە دەخایەنێ, بەلاّم هەوڵدان بۆ لە بیر بردنەوەی تەواوی ژیانی دەوێ.

"نەزانراو"

Anyone who has never made a mistake has never tried anything new."

ئەو کەسەی هیچ هەڵەیەکی لە ژیان نەکردووە, هەرگیز هیچ شتێکی نوێی تاقینەکردۆتەوە.

"ئەلبێرت ئەنیشتاین"

"We can't solve problems by using the same kind of thinking we used when we created them."

ناتوانین کێشەکان چارەسەر بکەین بە بەکارهێنانی هەمان ئەو مێشك و هەمان بیرۆکەی کە پەنامان بۆ بردون لە ساتی خولقاندنی کێشەکان.

"ئەلبێرت ئەنیشتاین"

"Everyone thinks of changing the world, but no one thinks of changing himself.

هەموو کەس بیر لە گۆرینی جیهان دەکاتەوە بەڵام هیچ کەس بیر لە گۆرینی خۆی ناکاتەوە.

"لیۆ تۆلستۆی"

Best love message I’ve ever heard..."I BELIEVE IN LOVE AT FIRST SIGHT"...Because I'VE BEEN LOVING MY MOTHER SINCE I OPENED MY EYES....

جوانترین نامەی خۆشەویستی کە تـا ئێـستا گوێبیـستی بوبم..."باوەڕم بە خۆشەویستی هەیە لە یەکەم نیگاوە چونکە دایکم خۆشدەوێ لەوەتای چاوم کردۆتەوە".

"نەزانراو"

Love is blind because "My mother started loving me before seeing my face".

خۆشەویستی کوێرەیە چونکە" دایکم بەر لەوەی ڕووم ببینێ خۆشیویستووم".

"نەزانراو"

A mother is someone who will always have love for you, even when you set the carpet on fire.

دایك ئەو کەسەیە کە هەموو کات خۆشەویستی بۆت هەیە، هەتا ئەو کاتەش کە فەرش لەسەر ئاگر رادەخەی.

"نەزانراو"

A mother is someone who will always support you when you need it. She will always protect you, Guide you, and forgive you. A mother is someone who is not a human...but an angel.

دایك ئەو کەسەیە کە هەموو کات پاڵپشتیت دەکات کاتێ کە پێویستت بە یارمەتیە. هەموو کات دەتپارێزێ. رێت نیشاندەدا. لێت دەبورێ. دایك کەسێکە کە مرۆڤ نیە... بەڵکو فریشتەیە...

"نەزانراو"

My mom is a never-ending song in my heart of comfort, happiness, and being. I may sometimes forget the words but I always remember the tune.

دایکم گۆرانیەکی بێ کۆتایی ئاسوودەیی و بەختەوەری و بوونی ناو دڵمە. رەنگە هەندێ کات وشەکانی لەبیرکەم بەڵام هەموو کات ئاوازەکەم لەبیرە.

"نەزانراو"

Love your mom as she loved you.

دایکت خۆشبوێ وەك ئەوەی خۆشیدەویێ.

"نەزانراو"

My mother had a slender, small body, but a large heart - a heart so large that everybody's joys found welcome in it, and hospitable accommodation.

دایکم جەستەیەکی لاوازو بچوکی هەیە بەلاَم دلێکی گەورەی هەیە, دلێکی زۆر گەورە کە هەموو کەس شادی و مالێکی بەخشندەی تیا دەدۆزێتەوە.

"مارك تواين"

All that I am or hope to be, I owe to my angel mother.

بە هەموو ئەوەی کە هەم و هیوای ئەوە دەخوازم ببم, قەرزداری دایکی فریشتەئاسای خۆمم.

"ئەبراهام لینکۆلن"

A man loves his sweetheart the most; his wife the best, but his mother the longest.

پیاو زۆرترین خۆشەویستی بۆ خۆشەویستەکەی هەیە, بە باشترین شێوە خێزانەکەی خۆش دەوێ, بەڵام بۆ درێژترین ماوە دایکی خۆش دەوێ.

"پەندێکی ئێرلەندی"

A mother's arms are made of tenderness and children sleep soundly in them.

قۆڵی دایك لە میهرەبانی دروستکراوە و منداڵ بە ئارامی تیایدا دەخەوێ.

"ڤیکتۆر هۆگۆ"

Heaven is at the feet of Mothers.

بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە.

"محمد (د.خ)"

My mother was the most beautiful woman I ever saw. All I am I owe to my mother. I attribute all my success in life to the moral, intellectual and physical education I received from her.

دایکم جوانترین ئافرەت بوو کە لە ژیانما بینیومە, بە هەموو بونمەوە قەرزاری دایکمم. هەموو سەرکەوتنەکانی ژیانم دەگەڕێنمەوە بۆ ئەو پەروەردە ئەخلاقی و جەسەدی و رۆشنبیرییەی کە لە ئەوم وەرگرتووە.

"جۆرج واشنتۆن"

Let France have good Mothers, and she will have good sons.

با فەرەنسیەکان دایکانێکی باشیان هەبێت, بۆ ئەوەی کوڕانێکی باشیان هەبێت.

"ناپلیۆن بۆناپەرت"

Never marry a man who hates his mother, because he'll end up hating you.

هەرگیز هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێك مەکە کە رقی لە دایکیەتی, چونکە لە کۆتاییدا رقی لە تۆش دەبێتەوە.

"جیلّ بێنبت"

Home is where your Mom is.

ماڵ ئەو شوێنەیە کە دایکی لێیە.

"نەزانراو"

:Remember

Who was the angel who first held you in her arms?
Who helped you to take your first step?
Who first fed you?
The world calls her a 'Mother'.

لەبیرت بێت:

یەکەم فریشتە کێ بوو لە باوەشی گرتی؟

کێ یارمەتیدای هەنگاوی یەکەمت باوێی؟

کێ یەکەم جار شیری پێدای؟

جیهان بە "دایك" بانگی دەکەن...

"سانسۆش"

Great mothers build bridges instead of walls.

دایکە باشەکان پرد دروست دەکەن لەبڕی دیوار.

"نەزانراو"

"Mom, I Love You More Than You Love Me"
"How Can You Prove This, Dear?"
"Because, you've 2 Sons and I Have Only 1 Mother!"

"دایکە زیاتر لەوە خۆشمدەوێی کە خۆشتدەوێم"

"چۆن بۆم دەسەلمێنی ئەزیزم؟"

"چونکە تۆ دوو کوڕت هەیە بەڵام من تەنیا یەك دایکم هەیە"

"نەزانراو"

A mum is a rose whose petals are soft,
A mum is a person who is never wrong,
and A mum is a person u should love forever....
so trust her, believe her & never doubt her.

دایك گوڵێكه كه پەڕەكانی نەرمە,

دایك كەسێكه كه هەرگیز هەڵه ناكات,

دایك ئەو كەسەیه كه دەبێ بۆ هەمیشه خۆشتبوێ,

بۆیه متمانەت پێی هەبێ, بڕوای پێ بكه, هەرگیز گومانی لێمەكه.

"نەزانراو"

Only person who never left me is my mom.

تەنیا کەسێك کە هەرگیز جێی نەهێشتم دایکمە.

"جۆناسان گۆسپەر"

Every successful child is the product of an enthusiastic mother.

هەموو منداڵێکی سەرکەوتوو بەرهەمی دایکێکی بە جۆشە.

"رید مارکهام"

A Mother's Love is the language of the heart.

خۆشەویستی دایك زمانی دڵە.

"نەزانراو"

"Of all the rights of women, the greatest is to be a mother."

له ناو هەموو مافەكانی ئافرەت گەورەترینیان" بوون به دایكه".

"لین یوتانگ"

If a mother believes that her child will succeed, the child will succeed.

ئەگەر دایك باوەڕی وابوو منداڵەكەی سەركەوتوو دەبێت, منداڵەكە هەنگاو بەرەو سەركەوتن دەنێت.

"رید ماركهام"

No language can express the power and beauty and heroism of a mother's love.

هـيچ زمانێـك نـاتوانێ هێـزو جـوانی و گـەورەیی خۆشەویستی دایك دەربڕێ.

"ئیدوین چاپین"

One of a mother's greatest joys .is to be imitated by her child

یەكێك لە گەورەترین خۆشیەكانی دایك ئەوەیە لەلایەن منداڵەكەی لاسایی بكرێتەوە.

"رید ماركهام"

4876

Mothers can look through a child's eyes and see tomorrow.

دایك دەتوانێ سەیری چاوەكانی منداڵەكەی بكاو بەیانی ببینێ.

"رید ماركهام"

Great mothers know that you can't hire someone to take their place.

دایكە باشەكان دەزانن كەوا ناكرێ كەسێك بەكرێ بگری بۆ منداڵەكەت تا جێی دایكی بگرێتەوە.

"رید ماركهام"

Mothers can see tomorrow in a little child's eyes. A great mother helps the child to see a better future.

دایك دەتوانێ داهاتوو لە چاوی منداڵەکەی ببینێ. دایکە باشەکان یارمەتی منداڵەکانیان دەدەن تا داهاتویەکی باشتر ببینن.

"نەزانراو"

The mother's heart is the child's schoolroom."

دڵی دایك پۆلی قوتابخانەی منداڵەکەیەتی.

"هێنری بیچەر"

Mother: the most beautiful word on the lips of mankind.

دایك: جوانترین وشەی سەر لێوی بونەوەرە.

"جبران خليل جبران"

Noble mothers guide their children with values; encourage them to move forward, and open doors to their future.

دایکە رەسەنەکان بە گرنگیەوە رێنمونی منداڵەکانیان دەکەن. هانیان دەدەن بۆ بەرەو پێش چوون، وە دەرگای داهاتویان بۆ دەکەنەوە.

"نەزانراو"

My mother is a poem
I'll never be able to write,
though everything I write
is a poem to my mother.

دایکم هۆنراوەیەکە کە هەرگیز توانای نوسینیم نیە،
لە کاتێکدا هەر شتێك کە دەینوسم هۆنراوەیەکە بۆ دایکم.

"شارۆن دۆباجیۆ"

Love’s Friendship never see older or younger, poor or rich, ugly or cute, far away or nearby, perfect or not perfect coz it’s from the heart!!!

خۆشەویستی هاوڕێیەتی هەرگیز گەورەو بچوکی، دەوڵەمەندی و هەژاری، جوانی و ناشرینی، دووری و نزیکی، باشی و خراپی نابینێ چونکە لە دڵەوەیە.

"ڕەیچڵ نێلیس"

Never explain yourself. Your friends don’t need it and your enemies won’t believe it.

هەرگیز باسی خۆت مەکە، هاوڕێکانت پێویستیان پێ نیە و دوژمنەکانیشت باوەرت پێ ناکەن.

"بێلجیسیا مۆویل"

You listen when I have a
problem
and help dry the tears from my
face.
You take away my sorrow
and put happiness in its place.

گوێم بۆ دەگری کاتێ کێشەم هەیە

وە یارمەتیم دەدەی بۆ سڕینەوەی فرمێسکی ڕووم

خەمەکانم وەلا دەنێی و بەختەوەری لە شوێنی دادەنێی

"ڕەیچڵ ئێلیس"

A friend is not the one that will
kill for you, but the one that will
die for you.

هاوڕێ ئەو کەسە نیە کە لە پێناوت خەڵك دەکوژێ،

هاوڕێ ئەو کەسەیە کە لە پێناوت دەمرێ.

"پێس"

We can't forget the fun we've had
Laughing 'til our faces turn blue.
Talking of things only we find funny
People think we're insane -If they only knew!

ناتوانین ئەو خۆشیانە لە بیر بکەین کە هەمان بوو
پێکەنین تا ئەو ساتەی دەم و چاومان شین هەڵدەگەڕا
گفتوگۆ سەبارەت بەو شتانەی خۆشیمان تیا دەبینی
هەر کەس ئێمەی ناسیبا, وای دەزانی شێتین

"رەیچڵ ئێلیس"

What is a friend? A single soul dwelling in two bodies

هاورێیەتی چیە؟ دوو رۆحە کە نیشتەجێی یەك جەستەن.

"ئەریستۆتاڵ"

If you're alone, I'll be your shadow. If you want to cry, I'll be your shoulder. If you want a hug, I'll be your pillow. If you need to be happy, I'll be your smile... But anytime you need a friend, I'll just be me."

ئەگەر تەنیای، دەبم بە سێبەرت. گەر دەتەوێ بگری، من دەبم بە پەناگەی ئارامیت. گەر باوەشت دەوێت دەبم بە سەرینت. گەر دەتەوێ دڵخۆش بیت، دەبم بە زەردەخەنەت. بەڵام هەر کاتێك پێویستت بە هاورێییەك بوو، تەنیا خۆم دەبم...

"نەزانراو"

True friends stab you in the front.

هاورێی ڕاستەقینە لە پێشەوە چەقۆت لێدەدا.

"ئۆسکار وایلد"

A friend is someone who knows the song in your heart and can sing it back to you when you have forgotten the words.

هاوڕێ ئەو کەسەیە کە گۆرانی ناو دڵت بزانێ و بشتوانێ بیلێتەوە کاتێ تۆ وشەکان لە بیر دەکەی...

"نەزانراو"

Friendship is like standing on wet cement. The longer you stay, the harder it's to leave, and you can never go without leaving your footprints behind.

هاوڕێیەتی وەك راوەستان لەسەر چیمەنتۆی تەڕ وایە, چەندی زیاتر بمێنیەوە, ڕۆیشتنت زەحمەتتر دەبێت, وە هەرگیز ناتوانی بڕۆی بەبێ جێهێشتنی شوێن پێیەکانت لە دوای خۆت...

"مۆی"

Another month. Another year.
Another smile another tear.
Another winter and another
summer too
but there can never be another
you

مانگێکی تر، ساڵێکی تر

زەردەخەنەیەکی تر، فرمێسکێکی تر

زستانێکی تر , بەهارێکی تر

هەموو ئەمانە هەن بەڵام تۆیەکی تر هەرگیز نیە

"مادی"

A true friend sees the first tear... catches the second... and stops the third

هاوڕێی راستەقینە فرمێسکی یەکەمت دەبینێ و دووەمت

دەسڕێتەوەو سێیەمت رادەوەستێنێ.

"ئەنجێلیکا"

Of all the friends I've ever met, you're the one I won't forget and if I die before you do I'll go to heaven and wait for you.

له ناو هەموو هاوڕێکانم کە تا ئێستا بینیومن, تۆ ئەو هاوڕێیەی کە لە بیری ناکەم و بەر لە تۆش دەمرم, دەچمە بەهەشت و چاوەڕێت دەکەم...

"نەزانراو"

When we first talked to each other, I knew we would always be friends.
Our friendship has kept on growing and I'll be here for you to the end.

کاتێ بۆ یەکەم جار بەیەکەوە قسەمان کرد
دەمزانی بۆ هەمیشە هاوڕێ دەبین
هاوڕێیەتیمان پەرەی سەند
وە من لەگەڵتام تا کۆتایی

"ڕەیچڵ ئێلیس"

A true friend...
-Accepts you as you are
-believes in you
-calls you only to say "hello"
-doesn't give up with you
-admires all sides of your personality
-forgives your mistakes
-helps you
-encourages you to try it again
-makes a difference in your life
-says nice things about you
-offers his/her support
-understands you
-tells you the truth
-explains things you don't understand
-walks by your side
-calms down your fears
-shouts if necessary, if you don't want to listen
-raises you spirit.

**هاوڕێی راستەقینە:**

- قبوڵت دەکا وەك ئەوەی کە هەی.
- متمانەی پێت هەیە.
- تەنیا بۆ هەواڵ پرسین پەیوەندیت پێوە دەکات.
- بێ ئومێد نابێ لەگەڵت.
- سەرسامە بە هەموو لایەنەکانی کەسایەتیت.
- لە هەڵەکانت دەبورێ.
- یارمەتیت دەدا.
- هانت دەدات تا دوبارە هەوڵبدەیتەوە.
- جیاوازی لە ژیانت دروست دەکات.
- باس لە شتە باشەکانت دەکات.
- پاڵپشتیت دەکات.
- لێت تێدەگات.
- راستیەکانت پێ دەڵێ.
- ئەو شتانەت بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لێی تێناگەی.
- لە تەنیشتتەوە دەڕوا.
- ترست دەڕەوێنێتەوە.
- گەر پێویست کات لەسەرت هاوار دەکا, لە کاتێکدا کە تۆ گوێ ناگری.
- رۆحیەتت بەرز دەکاتەوە. "نەزانراو"

Friends are like stars, they come and go, but the
Ones that stay are the ones that glow.

هاوڕێکـــان وەك ئەســـتێرە وان, دێـــن و دەڕۆن, بـــەلاّم ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە دەدرەوشێتەوە.

"ڕۆکسی کویکسیلڤەر"

A friend is someone who understands your past, believes in your future, and accepts you today just the way you are.

هاوڕێ ئەو کەسەیە کە لە ڕابردووت تـێ بگـات, بـاوەڕی بە داهاتووت هەبێت و ئەمڕۆت قبولّ بکات بـەو شـێوەی کە هەی.

"نەزانراو"

Walking with a friend in the dark is better than walking alone in the light.

پیاسە کردن لەگەڵ هاورێیەك لە تاریکیدا باشترە لە پیاسە کردن بە تەنیایی لە روناکیدا.

"هێلین کیلەر"

Friendship isn't about whom you have known the longest... It's about whom came, and never left your side...

هاورێیەتی ئەوە نیە کێ بۆ زۆرترین ماوە دەناسی، ئەوەیە کە کێ دێت و هەرگیز جێتناهێڵێت.

"رافنی"

"A faithful friend is the medicine of life."

هاورێی بە وەفا دەرمانی دەردی ژیانە.

"ئەپۆکرایفا"

It's really amazing when two strangers become the best of friends, but it's really sad when the best of friends become two strangers.

بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەرە کاتێ دوو کەسی نامۆ دەبن بە دوو باشترین هاوڕێ، بەڵام بەراستی ناخۆشە کاتێ دوو باشترین هاوڕێ دەبن بە دوو کەسی نامۆ.

"هیسەر کۆردێرا"

True friends can see the hurt in your eyes when everyone else is fooled by your smile.

هاوڕێی راستەقینە ئازارەکان لە چاوت دەبینێ لە کاتێکدا ئەوانی تر هەموو بە زەردەخەنەت هەڵخەڵەتاون.

"نەزانراو"

If one day you want to cry, just call me. I can't promise I'll make you laugh, but I can cry with you.
If one day you want to run away, don't be afraid, just call me. I can't promise I'll make you stop, but I can run with you.
If one day you are bored, just call me. I can't promise I will entertain you, but I can tell you I am bored too.

ئەگەر رۆژێك ویستت بگری یەكسەر پەیوەندیم پێوە بكە, ناتوانم بەڵێنت پێ بدەم كە وات لێبكەم پێبكەنی, بەلآم دەتوانم لەگەڵت بگریم. ئەگەر رۆژێك ویستت ڕا بكەی, مەترسە یەكسەر پەیوەندیم پێوە بكە, بەڵێنی ئەوەت پێ نادەم كە بتوانم بتوەستێنم بەلآم دەتوانم لەگەڵت ڕاكەم. ئەگەر رۆژێك بێزار بویت یەكسەر پەیوەندیم پێوە بكە, بەلێنی ئەوەت پێنادەم دڵخۆشت بكەم بەلآم دەتوانم پێت بڵێم كەوا منیش بێزارم.

"نەزانراو"

Sometimes I wonder what my life would be like without you. Then I thank God I only have to wonder.

هەندێ جار خەیاڵی ئەوە دەکەم دەبێ ژیانم چۆن بێت بەبێ تۆ, دوایی سوپاسی خوا دەکەم کە تەنیا خەیاڵە.

"نەزانراو"

"False friends are like a shadow, they're with you while you're in the sunshine, but leave you the minute you cross into the shade."

هاوڕێی خراپ وەك سێبەر وایە, کاتێ کە دەدرەوشێیتەوە لەگەڵتە بەلاَم کاتێ بەرەو تاریکی دەڕۆی ئیتر جێت دێڵێ.

"نەزانراو"

A friend indeed is a friend in need.

هاوڕێی راستەقینە لە كاتی تەنگانە دەردەكەوێ.

"پەندێكی ئینگلیزی"

Friendship is the hardest thing in the world to explain. It's not something you learn in school. But if you haven't learned the meaning of friendship, you really haven't learned anything.

هاوڕێیەتی قورسترین شتە لە جیهان بۆ ڕوونكردنەوە, شتێك نیە لە قوتابخانە فێری بیت. بەڵام ئەگەر لە مانای هاوڕێیەتی نەگەیشتی, تۆ بەراستی فێری هیچ نەبووی .

"محمد علی"

When a friend is in trouble, don't annoy him by asking if there is anything you can do. Think up something appropriate and do it.

کاتێ کە هاورێیەکت کێشەی هەیە, بە پرسیارکردنی ئەوەی گەر پێویستی بە شتێك بێت بێزاری مەکە. بیرکەوە شتێکی گونجاو بدۆزەوەو ئەنجامی بدە.

"ئێدگار واتسن"

A real friend is one who walks in when the rest of the world walks out.

هاوڕێی راستەقینە ئەو کەسەیە کە بەرەو ڕووت دێت لە کاتێکدا هەموو دونیا لێت دوور دەکەوێتەوە.

"والتر وانچل"

A good friend is a connection to life - a tie to the past, a road to the future, the key to sanity in a totally insane world.

هاورێ باشەکان پەیوەندی ئێمەن بە ژیان، بە رابردوو دەمانبەستنەوە و رێگامانن بەرەو داهاتوو، کلیلی بیرمەندیمانن لە دونیای بێ ئەقڵیدا.

"لویس وایس"

A single rose can be my garden... a single friend, my world.

تەنیا گوڵێك باخچەی منە بەڵام تەنیا هاورێیەك دونیای منە.

"لیۆ باسکاگلیا"

Nothing but heaven itself is better than a friend who is really a friend.

تـەنیا بەهەشـت لـە هاورێیـەك باشـترە كـە بەراسـتی هاورێیە.

"پلۆتۆس"

In my friend, I find a second self.

لە هاورێکەم (خۆم)ێکی تر ئەدۆزمەوە.

"ئیزابێل نۆرتن"

No road is long with good company.

هیچ رێگایەك لەگەڵ هاورێی باش درێژ نیە.

"پەندێکی تورکی"

Only your real friends will tell you when your face is dirty.

تــەنیا هــاوڕێ راســتەقینەکانت پێتــدەڵێن دەم و چــاو (ڕوو)ت پیسە.

"پەندێکی ڕۆمانی"

The antidote for fifty enemies is one friend.

دەرمانی پەنجا دوژمن تەنیا یەك هاوڕێیە.

"ئەریستۆتاڵ"

The best way to destroy an enemy is to make him a friend

باشترین ڕێگا بۆ تێکشکاندنی دوژمن ئەوەیە بیکـەی بـە هاوڕێ.

"ئیبراهیم لینکۆڵن"

The stupid neither forgive nor forget; the naïve forgive and forget; the wise forgive but do not forget.

کەسی بێ مێشك نە لە کەس دەبورێ نە لە بیریشی دەکا, کەسی ساویلکە لێی دەبورێ و لە بیریشی دەکا, کەسی هۆشمەند و ژیر لێی دەبورێ بەلاَم لە بیری ناکات.

"تۆماس ساز"

I have learned that sometimes "sorry" is not enough.
Sometimes you actually have to change.

فێری ئەوە بوومە کە هەندێ کات تەنیا "ببورە" بەس نیە. هەندێ کات تۆ دەبێ بەڕاستی بگۆڕێی.

"کلێر لەندەن"

Forgiving is not forgetting. It's letting go of the hurt.

لێخۆشبوون مانای لە بیرکردن نیە. ڕزگاربوونە لە ئازار.

"کاسی."

The weak can never forgive. Forgiveness is the attribute of the strong.

مرۆڤی لاواز هەرگیز ناتوانێ لە کەس ببورێ. لێبوردەیی تایبەتمەندی مرۆڤە بەهێزەکانە.

"غاندی"

Always forgive your enemies - Nothing annoys them so much.

هەمیشە لە دوژمنەکەت خۆشبە, هیچ شتێك لەوە زیاتر پەستیان ناکا. ( چاکترین تۆڵە بۆ دوژمنەکەت لێخۆشبونیەتی).

"ئۆسکار وایلد"

I don't forgive people cause I'm weak
I forgive them cause I'm strong enough
to understand people make mistakes.

که له خه‌ڵك ده‌بورم له‌به‌ر ئه‌وه نیه که بێ هێزم
له‌به‌ر ئه‌وه ده‌یانبورم که ئه‌وه‌نده به‌هێزم تا
له‌وه تێبگه‌م خه‌ڵکی هه‌ڵه ده‌که‌ن.

"مێیدی"

We achieve inner health through forgiveness- the forgiveness not only of others but also for ourselves.

له رێگه‌ی لێخۆشبوونه‌وه ئاسوده‌یی ده‌روون به‌ده‌ست
دێنین_ ته‌نیا لێخۆشبوونی ئه‌وانی تر نا به‌ڵکۆ
لێخۆشبوونی خۆشمان.

"جۆشوا لیبمان"

A little girl was asked what forgiveness is...
She gave a beautiful answer...
"It is the fragrance that flowers give when they are crushed..."

کـچێکی بـچکۆلە پرسـیاری ئـەوەی کـرد لێبـوردەیی

چیە... وەڵامێکی جوانی داوە...

"ئەو بۆنەیە کە گوڵ دەیدا لە کاتی وردبونیدا"

"نەزانراو"

There is no love without forgiveness, and there is no forgiveness without love.

خۆشەوستی بوونی نیە بێ لێبوردەیی, لێبوردەیی

بوونی نیە بێ خۆشەویستی.

"برایان میکجیل"

Apologizing does not always mean that you are wrong and the other person is right. It just means that you value your relationship more than your ego.

داوای لێبوردن کردن هەموو کات مانای ئەوە ناگەیەنێ کە تۆ هەڵەی و کەسی بەرامبەر دروستە. تەنیا مانای ئەوەیە کە پەیوەندی نێوانتان بە گەورەتر لە خۆت دەزانی.

"نەزانراو"

The secret of forgiving everyone is to understand nothing.

نهێنی لیخۆشبوونی هەموو کەس تێنەگەیشتنە لە هیچ.

"بیرنارد شۆ"

Without forgiveness, there's no future.

بێ لێبوردەیی داهاتوو بوونی نیە.

"دێزمۆند توتو"

Why do I always forgive you? I let you call me so many names, I let you treat me like dirt, yet I'm still your friend. Am I stupid? Or am I a good friend?

بۆچی هەموو کات لێت دەبوورم؟ لێدەگەڕێم بە چەندین ناو بانگم بکەی، لێدەگەڕێم وەك چڵکنێك هەڵس و کەوتم لەگەڵ بکەی، لە کاتێکدا من ئێستاش هاوڕێتم. ئایا من بێ مێشکم؟ یان هاوڕێیەکی باشم؟

"نەزانراو"

Forgiveness does not change the past, but it does enlarge the future.

لێخۆشبوون ڕابردوو ناگۆڕی، بەڵام داهاتوو بنیاتدەنێ.

"پۆڵ بۆیس"

Let us forgive each other- only then we will in peace.

با له یەکتر خۆشبین, چونکه تەنیا ڕێگەیە بۆ ئەوەی بە ئارامی بژین.

"لیۆ تۆلستۆی"

Never forget the three powerful resources you always have available to you: love, prayer, and forgiveness.

هەرگیز سێ سەرچاوەی گرنگی هێز لە بیر مەکە کە هەموو کات لە بەر دەستتە: عیشق, پاڕانەوە, لێبوردەیی.

"جاکسۆن براون"

Forgiveness is the sweetest revenge.

لێخۆشبوون شیرینترین تۆڵەیە.

"ئیسحاق فریدمان"

When you truly love someone, you forgive the unforgivable.

کاتێ بەڕاستی کەسێکت خۆشدەوێ، لەو شتانە دەبووری کە جێگای لێ بوردن نیە.

"نەزانراو"

Refusing to forgive someone is like drinking poison, and waiting for the other person to die.

ڕەتکردنەوەی لێ بوردنی کەسێك وەك ئەوە وایە ژەهر بخۆیت و چاوەڕێی ئەوە بکەی کەسانی تر بمرن.

"کاری فیشەر"

Sometimes you forgive people simply because you still want them in your life.

هەندێ کات زۆر بە ئاسانی لە خەڵك دەبوری چونکە دەتەوێ لە ناو ژیانت بن.

"نەزانراو"

I can forgive you for hurting me, but I can never forget!!

دەتوانم لێت ببورم لەوەی کە ئازارتدام، بەڵام هەرگیز ناتوانم لە بیری کەم.

"نەزانراو"

It's easier to forgive an enemy, than to forgive a friend.

لێخۆشبوون لە دوژمنەکەت ئاسانترە لە لێخۆشبوون لە هاورێکەت.

"ئۆسکارد وایلد"

My plan is to forgive & forget.
Forgive myself for being so stupid,
and forget you ever existed..

پلانم لێخۆش بوون و لەبیرکردنە:

لە بێ مێشکی خۆم خۆش بم و تۆ

لەبیرتکەم وەك ئەوەی قەت نەبوویی.

"نەزانراو"

Everyone says that forgiveness is a good thing to do ,
until they have something to forgive.

هەموو کەس دەلێت لێبوردەیی شتێکی باشە, تا ئەوەی

دەگەنە بارودۆخێك کە دەبێ لێبوردە بن.

"نەزانراو"

Sorry may have become "just another word", but with tears it means the world.

"ببوره" رەنگە تەنیا ببێ بە ووشەیەکی تر، بەڵام لەگەڵ فرمێسك مانای هەموو دونیا دەگەیەنێ.

"نەزانراو"

It's not about who's right or who's wrong, there more important things than that. That's why we have things like apologies and forgiveness.

گرنگ ئەوە نیە کێ راستە یان کێ هەڵەیە, شتی گرنگتر لەوە هەیە, هەر لەبەر ئەوەشە شتانێکی وەك و "داوای لێبوردن" و "لێبوردەیی" هەن.

"نەزانراو"

Forgiving doesn’t mean you are welcome again in my life... it is just that I don’t even want to have you in my mind by thinking of the pain you gave...!!

لێبوردن مانای ئەوە نیە دووبارە بەخێر بێیتەوە بۆ ناو ژیانم... تەنیا ئەوەیە کە تەنانەت نامەوێ لە مێشکیشم دابیت بە بیرکردنەوە لەو ئازارانەی کە پێتداوم.

"سیریشا"

What's done is done. No matter how much we want to change the past, we can’t...let bygones be bygones...and forgive and forget.

ئەوەی بوو بوو. گرنگ نیە تا چ ئاستێك دەمانەوێ رابردوو بگۆرین، ناتوانین... ئەوەی چوو چوو... لێبوردەبەو لە بیریکە.

"نەزانراو"

"One of the secrets of a long and fruitful life is to forgive everybody everything before you go to bed"

یەکێك لە نهێنیەکانی ژیانێکی درێژو پڕ بەرهەم ئەوەیە کە لە هەموو کەس ببوری بەر لەوەی بچی بۆ خەو.

"نەزانراو"

If you do not forgive, you're just the same as the person who did the mistake in the first place.

ئەگەر لێبوردە نەبیت, تۆ ڕێك وەك ئەو کەسە وای کە سەرەتا هەڵەی کردووە.

"نەزانراو"

**ADVICE:**

- If you were thinking about someone while reading this, you're definitely in Love.

**ئامۆژگاری:**

ئەگەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەوەدا بیر لە کەسێك دەکەیەوە, ئەوا تۆ بەراستی لە خۆشەویستی دای.

"نەزانراو"

The worst feeling you'll ever feel is sitting next to the person who means the world to you knowing that you mean nothing to them.

ناخۆشترین هەست ئەوەیە تۆ لە تەنیشت کەسێك دابنیشی کە هەموو شتێکە بۆ تۆ, ئەوەش بزانی کە تۆ هیچ نی بۆ ئەو.

"نەزانراو"

If I could give you one thing in life, I would give you the ability to see yourself through my eyes, only then would you realize how special you are to me...

ئەگەر توانیبام لە ژیان شتێکت پێ ببەخشم، توانای ئەوەم پێدەبەخشی کە لە چاوەکانی من خۆت ببینی، تەنیا بۆ ئەوەی بزانی کە چەند تایبەتی بۆ من.

"نەزانراو"

If you love someone put their name in a circle, not a heart, because hearts can be broken but circles go on forever!

ئەگەر کەسێکت خۆشدەوێ ناوەکەی لە ناو بازنەیەك دانێ نەك لە دڵ، چونکە دڵ دەشکێ بەڵام بازنەکان بۆ هەمیشە بەردەوام دەبن...

"نەزانراو"

If you truly love someone, then the only thing you want for them is to be happy....even if it's not with you...

ئەگەر بەراستی کەسێکت خۆشبوێت, ئەوا دەبێ تەنیا ئاواتی ئەوە بخوازی کە دڵ خۆش بێت... هەتا ئەگەر لەگەڵ تۆش نەبێت.

"لاوپێن"

You asked me whose life was more important- yours or mine and I answered "mine"; you walked away angry not knowing that you are my life.

لێت پرسیم ژیانی من گرنگترە یان هی تۆ, لە وەڵامدا گوتم ژیانی من: بە تورەییەوە ڕۆیشتی بێ ئەوەی بزانی کە تۆ ژیانی منی.

"نەزانراو"

One of the hardest things in life is watching the person you love, love someone else.

یەك لە ناخۆشترین هەستەكان ئەوەیە تۆ كەسێكت خۆشبوێ لە كاتێكدا ئەو كەسێكی تری خۆشدەوێ.

"نەزانراو"

I can live without money, but I cannot live without love.

دەتوانم بێ پارەو سامان بژیم بەلاَم ناتوانم بێ عەشق بژیم.

"جودی گارلاند"

Life without love is like a tree without blossoms or fruit.

ژیانی بێ عیشق وەك دارێكی بێ گوڵ و میوەیە.

"جبران خلیل جبران"

There is only one terminal dignity - love.

تەنیا یەك نەمری شكۆمەند هەیە ئەویش "ئەوین"ە.

"هێلین هایس"

A man falls in love through his eyes, a woman through her ears.

پیاوان بە چاوەكانیان دەكەونە داوی خۆشەویستی، ژنان بە گوێیەكانیان.

"وودرۆو وایت"

A woman would run through fire and water for such a kind heart.

ئافرەت بە ناو ئاوو ئاگر دا دەروات بۆ گەیشتن بە دڵێكی میهرەبان.

"شكسپیر"

A coward is incapable of exhibiting love; it is the prerogative of the brave

ترسنۆکەکان توانای ئەوەیان نیە خۆشەویستی پیشاندەن, ئەمە تواناو هێزی ئازاکانە.

"غاندی"

There are many in the world that is dying for a piece of bread, but there is many more dying for a little love.

خەڵکانێکی زۆر لەم دونیایە هەن کە دەمرن بۆ پاروە نانێك بەلاَم خەڵکانێکی زۆر زیاتر هەن کە دەمرن بۆ تۆسقاڵێك خۆشەویستی.

"تێریسا"

Love begins with a smile, grows with a kiss, and ends with a teardrop.

خۆشەویستی بە زەردەرخەنەیەك دەست پێدەكات و بە ماچێك گەورە دەبێت و بە فرمێسك ڕشتن كۆتایی دێت.

"نەزانراو"

First love is only a little foolishness and a lot of curiosity.

خۆشەویستی یەكەم تا ڕادەیەك بێ ئەقلیە بەلاَم دونیایەكە لە مەراق.

"بێرنارد شۆ"

Love is the beauty of the soul.

ئەوین جوانی ڕۆحە.

"سەینت ئۆگەستین"

Sometimes you need to run away just to see who will come after you.

هەندێ کات پێویستە ڕا بکەی تەنیا بۆ ئەوی بزانی کێ بە دواتەوە دێت.

"لیزا بروکس"

Love does not dominate; it cultivates.

ئەوین کۆنترۆڵ ناکرێ بەڵکو پەرەدەسەنێ.

"فۆن گەیسی"

At the touch of love everyone becomes a poet.

لەگەڵ بە دەست هێنانی ئەوین هەموو کەس دەبێ بە شاعیر.

"ئەفلاتون"

Love is life. And if you miss love, you miss life.

ئەوین ژیانە. گەر لە دەستت دا ئەوا ژیانت لە دەست داوە.

"لیۆ باسکالجیا"

Where there is love there is life.

لە هەر شوێنێك خۆشەویستی هەبێت ژیانیش هەیە.

"غاندی"

Love is composed of a single soul inhabiting two bodies.

ئەوین پێکهاتووە لە یەك رۆح لە دوو جەستەدا.

"ئەریستۆتاڵ"

Love is all we have; the only way that each can help the other.

ئـەوین هـەموو شـتێکە کـە هەمانـە: تاکـە ڕێگایـە بـۆ یارمەتیدانی ئەوانی تر.

"نەزانراو"

Love is something eternal; the aspect may change, but not the essence."

ئەوین شـتێکی نـەمرە: ڕەنگـە ڕوکـاری بگۆڕێـت, بـەڵام گەوهەری هەرگیز نا.

"نەزانراو"

"Love is the master key that opens the gates of happiness."

ئەوین کلیلی سەرەکی کردنەوەی دەرگای بەختەوەریە.

"نەزانراو"

"If you love me only in my dreams, let me be asleep forever."

گەر لە خەونەکانما خۆشتدەوێم, لێگەرێ با بۆ هەمیشە بنوم.

"نەزانراو"

Love is the flower you've got to let grow.

ئەوین گولێکە کە دەبێ لێگەڕێی گەشە بکات.

"جۆن لینۆن"

"One word frees us of all the pain in life. That word is Love...

یەك وشە ئازادمان دەکات لە دەست هەموو ئازارەکانی ژیان. ئەویش خۆشەویستیە.

"سۆفۆکلیس"

The rose speaks of love silently, in a language known only to the heart."

گـولْ بـه بـێ دەنگـی لـەبارەی ئەوینـەوە دەدوێ، بـە زمانێك كە تەنیا دڵ دەیزانێ.

"نەزانراو"

Like the measles, love is most dangerous when it comes late in life.

وەك نەخۆشی سورێژە، ئەوین زۆر مەترسیدارە كاتێ بە درەنگەوە دێتە ناو ژیانت.

"نەزانراو"

When you love someone, all your saved-up wishes start coming out."

كاتێ كە كەسێكت خۆشدەوێ، هەموو ئەو ئاواتانەی لـە ناخت دا هەڵتگرتووە دێنە دەرێ.

"نەزانراو"

"Love is like war: Easy to begin but hard to end."

خۆشەویستی وەك شەڕ وایە: دەستپێكردنی ئاسانە بەڵام كۆتایی هێنانی زۆر زەحمەتە.

"مێنكن"

Love is the only sane and satisfactory answer to the problem of human existence."

ئەوین تەنها وەڵامێكی ژیرانەو مقنعە بۆ كێشەی بوونی ئادەمیزاد.

"نەزانراو"

Too many people go through life waiting for things to happen instead of making them happen!

خەڵكانێكی زۆر چاوەڕێی ئەوە دەكەن ڕووداوەكان خۆیان ڕووبدەن لە بری ئەوەی خۆیان ڕوداوەكان بێننە بوون.

"ئەزیفدۆ"

You and your opponent want the same thing. The only thing that matters is who works the hardest for it.

تۆو دوژمنەكەت هەمان شتتان دەوێ. گرنگترین شت ئەوەیە كامەتان زیاتر كار دەكەن بۆ ئەو مەبەستە.

"نەزانراو"

Only one thing make a dreams impossible; the fear of failure...

تەنیا یەك شت وا دەكات هێنانەدی خەونەكان ببێ بە مەحاڵ: "ترس لە شكست"

"نەزانراو"

"Ability may get you to the top, but it takes character to keep you there."

هێـزو توانـا ڕەنگـە بتگەیـەنێت بـە لوتكـە, بـەڵام كەسایەتیەكی بەهێزی دەوێ بۆ مانەوەت لە لوتكە.

"جۆن وودن"

There are three ingredients in the good life: learning, yearning and earning.

سێ خاسیەت هەن بۆ ژیانێکی باش : فێربوون، ئارەزوو، بەدەست هێنان.

"کریستۆفەر مارلۆو"

"The difference between failure and success is doing a thing nearly right and doing a thing exactly right."

جیاوازی نێوان سەرکەوتن و شکست، کردنی ئەو شتەیە کە تا رادەیەك راستە لەگەڵ کردنی ئەو شتەی کە بە تەواوی راستە.

"ئێدوارد سایمۆن"

Success doesn't come to you, you go to it.

سەرکەوتن بەرەو تۆ نایەت, تۆ بەرەو سەرکەوتن دەڕۆی.

"مارڤا کۆلنز"

Successful men are influenced by desire for pleasing results. Failures are influenced by desire for pleasing methods.

پیاوی سەرکەوتوو ئارەزووی بەدەست هێنانی ئەنجامێکی دڵخۆشکەر کاریگەری لەسەر داناوە. پیاوی شکست خواردوو ئارەزووی بەدەست هێنانی شێوازیکی دڵخۆشکەر کاریگەری لەسەر داناوە.

"فرانك برێنان"

God gives every bird a worm, but he does not throw it into the nest.

خـودا کرمـی داوەتـە هـەموو چـۆلەکەیەك بـەڵام فرێـی نەداوەتە ناو هێلانەکانیان.

"پەندێکی سویدی"

Success depends upon previous preparation, and without such preparation there is sure to be failure.

سـەرکەوتن لەسـەر ئامادەکاریـەکانی پێـشوەختە وەسـتاوە, بـەبێ ئـەو ئامـادە کاریانـەش شکـست مسۆگەرە.

"کۆنفۆشیۆس"

The secret of success is constancy to purpose."

نهێنی سەرکەوتن بەردەوام بوونی مەبەستەکەیە.

"بێنجامین فرانکلین"

Try not to become a man of success, but rather try to become a man of value

هەوڵ مەدە ببی بە پیاوی سەرکەوتن, زیاتر هەوڵ بدە ببی بە پیاوی بەهاکان.

"ئەنیشتاین"

Pray that success will not come any faster than you are able to endure it.

دوعا بکە سەرکەوتن بەو خێراییە نێت کە نەتوانی بەرگەی بگری.

"ئەلبێرت هابەرد"

Failure is success if we learn from it.

شکست سەرکەوتنە گەر لێوەی فێربین.

"مالکۆلم فۆربیس"

Success is dependent on effort.

سەرکەوتن لەسەر هەوڵدان وەستاوە.

"سۆفۆکلیس"

I don't know the key to success, but the key to failure is trying to please everybody.

کلیلی سەرکەوتن نازانم بەڵام کلیلی شکست هەوڵدانە بۆ ڕازیکردنی هەموو کەس.

"بیل کۆسبی"

Success belongs to those who believe in the power of their ideas...

سەرکەوتن بۆ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە بەهێزی بیرو ڕاکانیان هەیە.

"نەزانراو"

I have learned that success is to be measured not so much by the position that one has reached in life as by the obstacles which he has had to overcome while trying to succeed.

ژیان فێری ئەوەی کردووم کە پێوانەی سەرکەوتن بەو مەکانەتە ناکرێ کە کەسێك پێیگەیشتووە لە ژیان، بەڵکو بەو بەربەستانەیە پێوانە دەکرێ کە بەسەریان دا زاڵ بووە لە کاتی هەوڵدان بۆ سەرکەوتن.

"بوکەر واشنتۆن"

I've failed over and over and over again in my life and that's why I succeed.

چەندین و چەندین جار لە ژیانما شکستم خوارد, هەر بۆیەش سەرکەوتوو بووم.

" مایکڵ جۆردان"

There are two types of people who will tell you that you cannot make a difference in this world: Those who are afraid to try and those who are afraid you will succeed.

دوو جۆری مرۆڤ هەن کە پێت دەڵێن تۆ ناتوانی جیاوازی لە ژیان دروست بکەی: ئەوانەی کە لە هەوڵدان دەترسن و ئەوانەش کە لە سەرکەوتنی تۆ دەترسن.

"رای گۆفۆرس"

The secret of success is to know something nobody else knows.

نهێنی سەرکەوتن ئەوەیە کە شتێك بزانی کە هیچ کەسی تر نەیزانێ.

"ئەریستۆتاڵ"

You are successful not because of the number triumphs and honor you have taken but by the number of times you recover from failures.

تۆ کەسێکی سەرکەوتوویی نەك بە هۆی ئەو سەرکەوتن و ڕێزەی کە بە دەستت هێناوە, بەڵکو بە هۆی ژمارەی ئەو کاتانەی کە شکستی خۆت چاك کردۆتەوە.

"نەزانراو"

You will never reach your destination if you stop and throw stones at every dog that barks.

هەرگیز ناگەیت بە ئامانجی خۆت ئەگەر بووەستی و بەرد لە هەر سەگێك بگری کە دەحەپێت.

"وینستۆن چەرچل"

Men are born to succeed, not fail

مرۆڤ بۆ سەرکەوتن لە دایك بووە نەك بۆ شکست.

"هێنری دەیڤد"

The greatest revenge is to accomplish what others say you cannot do.

گەورەترین تۆڵە بەدەست هێنانی ئەو شتەیە کە کەسانی تر دەڵێن ناتوانی بە دەستی بێنی.

"نەزانراو"

To learn to succeed, you must first learn to fail.

بۆ ئەوەی فێری سەرکەوتن بیت, سەرەتا دەبێت فێری شکست بیت.

"مایکڵ جۆردن"

The Road To Success Is Always Under Construction.

ڕێگای سەرکەوتن هەموو کات لە ژێر چاککردنەوە دایە.

"نەزانراو"

Behind every successful man is a surprised woman.

لەپشت هەر پیاوێکی سەرکەوتوو ئافرەتێك هەیە.

"ناپلیۆن بۆناپەرت"

Do not lower your goals to the height of your abilities. Instead, heighten your abilities to the level of your goals.

ئامانجەکانت نزم مەکەوە بۆ بەرزکردنـەوەی تواناکانـت, بەڵکو تواناکانت بەرز بکەوە بۆ ئاستی ئامانجەکانت.

"نەزانراو"

Every failure made me more confident. Because I wanted even more to achieve things, as revenge, to show that I could...

هـەر شکستێك وام لێـدەکات زیـاتر متمانـەم بـە خـۆم هەبێت. چونکە ئارەزووم بۆ بە دەست هێنـانی شـتەکان زیاتر دەبێت وەك تۆڵەیەك, بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کـە دەتوانم.

"نەزانراو"

Success in life can never be an accident. It is the result of right decisions at the right time. Champions are not the people who never fail, but the people who never quit...

سەرکەتن لە ژیان هەرگیز لە خۆوە نایەت. سەرکەوتن دەرەنجامی بڕیاری گونجاوە لە کاتی گونجاو. پاڵەوانەکان ئەوانە نین کە هەرگیز شکست ناخۆن، بەڵکو ئەوانەن کە هەرگیز بێ ئومێد نابن.

In life, there are no winners or losers...just different ways of playing the game.

لە ژیاندا براوەو دۆڕاو نیە... تەنیا شێوازی جیاواز هەیە بۆ یاریکردن.

"نەزانراو"

The hardest part of every day is waking up and asking myself if I’m ready to try to make myself better than I was yesterday.

ناخۆشترین بەشی ڕۆژ ئەوەیە کە بەیانی لە خەو هەستم و لە خۆم بپرسم ئایا ئامادەم وا لە خۆم بکەم کە لە دوێنێ باشتر بم.

"نەزانراو"

Success is like a drug. Once you achieve it, you always want more.

سەرکەوتن وەك مادەی بێهۆشکەر وایە. یەکجار بە دەستت هێنا, بە بەردەوام ئارەزووی زیاتر دەکەی.

"نەزانراو"

The road to success is dotted with many tempting parking spaces...

ڕێگای سەرکەوتن بە چەندین خاڵی وەستانی بێزارکەر گیراوە.

"نەزانراو"

Success is the courage to try...

سەرکەتن ئازایەتیە بۆ هەوڵدان.

"نەزانراو"

Let your heart rule your emotions, but let your mind rule your actions.

با دڵت بڕیار لەسەر هەستەکانت بدات بەڵام با مێشکت بڕیار لەسەر کردەوەکانت بدات.

"نەزانراو"

The steps to success are simple. Decide what you want. Determine the price. Pay the price.

قۆناغەکانی سەرکەوتن زۆر ئاسانە. بریار بدە کە چیت دەوێ. بەهاکەی دیاریکە. بەهاکەی (باجەکەی) بدە.

"بارکەر هەنت"

Some people dream of success... while others wake up and work hard at it.

هەندێ خەڵك خەون بە سەرکەوتنەوە دەبینن... لەو کاتەی کەسانی تر لە خەو هەڵدەستن و کار بۆ سەرکەوتن دەکەن.

"نەزانراو"

Nothing is impossible. For if you have a vision in your mind, act to achieve your picture, the picture will turn into reality. And you will have proven that impossible is nothing.

هیچ شتێك مەحاڵ نیە. ئەگەر شتێکت وێنا کردووە لە ناو مێشکت, کار بکە بۆ بە دەست هێنانی وێنەکەی, ئەم وێنەیە دەبێت بە ڕاستی. وە ئەوە دەسەلمێنی کە مەحاڵ بوونی نیە.

"نەزانراو"

Your determination today will lead to your success tomorrow.

سوور بوونی ئەمڕۆت دەبێتە هەوێنی سەرکەوتنی بەیانیت.

"دانتی"

In order to succeed, your desire for success should be greater than your fear of failure.

بۆ ئەوەی سەربکەویت پێویستە ئارەزووت بۆ سەرکەوتن گەورەتر بێت لە ترست بۆ شکست.

"بیلّ کۆسبی"

Our greatest glory consists not in ever falling, but in rising every time we fall."

گەورەیی ئێمە ئەوە نیە کە هەرگیز نەکەوین, بەڵکو هەڵسانەوەیە لە هەر کاتێك کە دەکەوین..

"نەزانراو"

If you never fell, how would you learn to rise?

ئەگەر هەرگیز نەکەوی, چۆن فێری هەڵسانەوە دەبی؟

"میچێلّ گراندی"

God won't ask what you did to help yourself, but will ask what you did to help others.

خودا پرسیاری ئەوەت لێ ناکا چیت کرد بۆ یارمەتیدانی خۆت, بەلأم پرسیاری ئەوەت لێ دەکا کە چیت کردووە بۆ یارمەتیدانی کەسانی تر.

"نەزانراو"

God won't ask what you did to protect your rights, but will ask what you did to protect the rights of others.

خودا پرسیاری ئەوەت لێ ناکا چیت کرد بۆ پاراستنی مافەکانی خۆت, بەلأم پرسیاری ئەوەت لێ دەکا کە چیت کردووە بۆ پاراستنی مافی کەسانی تر.

"نەزانراو"

Kindness is loving people more than they deserve.

میهرەبانی خۆشویستنی کەسانی ترە زیاتر لەوەی کە شایەنیانە.

"جۆزێف جۆبێرت"

Be kind to unkind people- they need the most.

لەگەڵ ئەوانە میهرەبانبە کە میهرەبا نین چونکە زیاتر لە هەموو کەس پێویستیان پێیە.

"ئاشلی بریلیانت"

Be kind, for everyone you meet in fighting the harder battle.

میهرەبانبە هەتا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە گۆرەپانی قورسترین شەردا چاوت پێیاندەکەوێ.

"ئەفلاتون"

I have learned silence from the talkative, toleration from the intolerant, and kindness from the unkind; yet, strange, I am ungrateful to those teachers.

بێ دەنگی لە زۆر ڕەوەکانەوە فێربووم، ئارامگرتن لە بێ ئارامەکانەوە فێربووم، میهرەبانی لە دڵڕەقەکانەوە فێربووم، ئێستاش سەیرە کە سوپاسگوزاری ئەو مامۆستایانە نیم.

"جبران خليل جبران"

Kindness is ever the begetter of kindness.

هەمیشە میهرەبانی هۆکاری میهرەبانیە.

"سۆفۆکلیس"

Kindness is in our power, even when fondness is not.

میهرەبانی هێز و وزەمانە, هەتا ئەگەر ئەوینداریش بوونی نەبێت.

"سامویل جۆنسن"

Kindness is like snow- it beatifies everything it covers.

میهرەبانی وەك بەفر وایە, هەموو شتێ جوان دەكا كاتێ كە دایدەپۆشێ.

"نەزانراو"

Kindness is a language the deaf can hear and the blind can see.

میهرەبانی زمانێكە كە كەرەكان دەیبستن و كوێرەكان دەیبینن.

"مارك تواین"

Never miss an opportunity to make others happy, even if you have to leave them alone in order to do it.

هیچ هەلێك بۆ خۆشحالّ كردنی كەسانی تر لە دەست مەدە, هەتا ئەگەر پێویست بكات بە جێیان بێلّی بۆ ئەوەی دلّخۆش بن.

"نەزانراو"

Treat everybody as if they were going to die tomorrow.

بە شێوەیەك هەلّس و كەوت لەگەلّ خەلّكیدا بكە وەك ئەوەی بەیانی دەمرن.

"نەزانراو"

Kindness is not a weakness; it's a manifestation of strength.

میهرەبانی بێهێزی نیە, بەڵکو نیشانەی بەهێزیە.

"نەزانراو"

Sometimes the heart sees what is invisible to the eye.

هەندێ کات دڵ ئەو شتانە دەبینێ کە چاو ناتوانێ بیانبینێ.

"جاکسۆن براون"

Kindness starts from the heart and ends with extended hands.

میهرەبانی لە دڵەوە دەست پێدەکات و بە دەستێکی بەخشەرو یارمەتیدەر کۆتایی دێت.

"نەزانراو"

One of the greatest gifts you can give to anyone is the gift of your attention.

یەکێك لەو گەورەترین ئەو دیاریانەی کە دەتوانی بیدەی

بە کەسێك ئەوەیە بایەخی پێبدەی.

"نەزانراو"

The best index to a person's character is (a) how he treats people who can't do him any good, and (b) how he treats people who can't fight back.

باشترین پێوانە بۆ زانینی کەسایەتی کەسێك:

١- چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات

کە هیچ چاکەیەکیان بۆ ئەو نیە.

٢- چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات

کە ناتوانن بەرگری بکەن.

"نەزانراو"

Act of the day (one for every day of the week):
make someone smile
say hello to a stranger
help someone for nothing in return
do something to make you smile
let a friend know how much they mean to you
send a message of love to family

بۆ هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هەفتە بەم شێوەیە کار بکە:

کەسێك بە پێکەنین بێنە

سلاو لە کەسێکی نەناسراو بکە

یارمەتی کەسێك بدە بە بێ هیچ بەرامبەرێك

لێگەڕێ با هاورێیەکت بزانی کە چەند گرنگە بۆ تۆ

نامەیەکی پڕ لە خۆشەویستی بۆ خانەوادەکەت بنێرە.

"نەزانراو"

When you dig another out of their troubles, you find a place to bury your own.

کاتێ کەسێك لە کێشەکانی دەردێنی، شوێنێك دەدۆزیەوە بۆ ناشتنی کێشەکانی خۆت.

"نەزانراو"

Treat everyone with politeness, even those who are rude to you - not because they are nice, but because you are.

بە ئەدەبەوە هەڵس و کەوت لەگەڵ هەموو کەس بکە، هەتا ئەوانەش کە بێ ڕەوشتن بەرامبەرت، لەبەر ئەوە نا کە ئەوان ڕووخۆشن، لەبەر ئەوەی تۆ وای.

"نەزانراو"

Kind words can be short and easy to speak, but their echoes are truly endless.

قسەی خۆش ئاسان و کورتە بۆ گوتن بەڵام کاریگەریان بەڕاستی بێ کۆتاییە.

"تێریسا"

Remember that whenever you give, do it with the intention of pleasing God; without any hope for fame, respect or reward from others.

لە بیرت بێت هەر شتێك كە دەیبەخشی بە نیازی رازیکردنی خودا بیبەخشە: بێ ئەوەی بە هیوای ناوبانگ و رێزو خەڵات بیت لە مرۆڤەکان.

"نەزانراو"

Kind words do not cost much.
Yet they accomplish much.

قسەی خۆش زۆری تێ ناچێت لە کاتێکدا زۆری لێ بەدەست دێنی.

"پاسکاڵ"

There is only one way of not hating those who do us wrong, and that is by doing them good.

تەنیا ڕێگایەك بۆ ئەوەی ڕقمان لەوانە نەبێتەوە کە خراپەمان بەرامبەر دەکا ئەوەیە چاکەیان لەگەڵ بکەین.

"هێنری ئەمیل"

Kindness is a best heroism.

میهرەبانی باشترین قارەمانیەتیە.

"نەزانراو"

What you do not want others to do to you, do not do to others.

ئـەوەی کـە حەزناکـەی خـەڵك لەگـەڵتی بکـات, لەگـەڵ خەڵکی مەیکە.

"کۆنفۆشیۆس"

It is easy to perform a good action, but not easy to acquire a settled habit of performing such actions."

ئەنجامدانی کاری باش ئاسانە, بـەڵام بەدەسـت هێنـانی نەریتێکی جێگیر بۆ ئەنجامدانی ئاسان نیە.

"ئەریستۆتاڵ"

A person's true wealth is the good he or she does in the world."

سامانی راستەقینەی هەر مرۆڤێك ئەو چاكانەیە كە دەیكات لە دونیادا.

"موحەمەد (د.خ)"

The best way to find yourself is to lose yourself in the service of others."

باشترین رێگا بۆ دۆزینەوەی خۆت, ونكردنی خۆتە لە خزمەتی ئەوانی تر.

"غاندی"

Compassion is the chief law of human existence.

بەزەیی رێسای سەرەكی بوونی ئادەمیزادە.

"دۆستۆفسكی"

Respect others if you want others to respect you.

گەر دەتەوێ کەسانی تر ڕێزت بگرن ئەوا ڕێزیان بگرە.

"نەزانراو"

Harsh words break no bones but they do break hearts..........

قسە ڕەقەکان ئێسك ناشکێنن بەڵام دڵ دەشکێنن.

"نەزانراو"

Words of kindness are more powerful than cruel swords.

وتە میهرەبانەکان(خۆشەکان) زۆر لە شمشێرە تیـژەکان بەهێزترن.

"نەزانراو"

One kind word can warm three winter months.

یەك قسەی خۆش دەتوانێ سێ مانگی زستان گەرم کاتەوە.

"پەندێکی ژاپۆنی"

Kindness is like sugar, it makes life taste a little sweeter.

میهرەبانی وەك شەکر وایە, تامی ژیان خۆشتر دەکات.

"کارلا پۆرفی"

Kindness is global word that can be translated in black and white.

میهرەبانی وشەیەکی جیهانیە کە دەتوانرێ بە ڕەش و سپی وەربگێردرێ.

"مێنری"

Each morning when I open my eyes I say to myself: I, not events, have the power to make me happy or unhappy today. I can choose which it shall be. Yesterday is dead, tomorrow hasn't arrived yet. I have just one day, today, and I'm going to be happy in it.

هەموو بەیانیەك كە چاوم دەكەمەوە بە خۆم دەڵێم: خۆم دەتوانم وا لە خۆم بكەم ئەمڕۆ دڵ خۆش بم یان دڵ تەنگ بم نەك ڕووداوەكان. دەتوانم هەڵبژێرم كامەیان بم. دوێنێ مرد، بەیانی هێشتا نەهاتووە. تەنیا یەك ڕۆژم هەیە "ئەمڕۆ" وە من تیایدا دڵ خۆش دەبم.

"ماركس"

When I was in grade school, they told me to write down what I wanted to be when I grew up.
I wrote down happy.
They told me I didn't understand the assignment,
I told them they didn't understand life.

کاتێ لە قوتابخانەی هەڵسەنگاندن بووم، پێیان وتم

بنووسە حەز دەکەی ببی بە چی کاتێ کە گەورە بووی.

نووسیم دەمەوێ " بەختەوەربم "

پێیان وتم تێنەگەیشتین لە جۆری کارەکە،

پێم وتن ئێوە لە ژیان تێنەگەیشتوون.

"نەزانراو"

Being happy doesn't mean you're perfect. It just means you've decided to look beyond the imperfections.

بەختەوەربوونت مانای ئەوە نیە کە تۆ کەسێکی نموونەیی. مانای ئەوەیە کە تۆ بڕیارت داوە سەیری دواوەی کەم و کوڕیەکان بکەی.

"ئیندیانا"

Nobody can take away your pain... so don’t
let anyone take away your happiness

هیچ کەسێك ناتوانێت ئازارەکانت لێ دوورخاتەوە...
بۆیە ڕێگە بە هیچ کەس نەدەی بەختەوەریت لێ دوورخاتەوە.

"نەزانراو"

"For once in my life, I don't have to try to be happy. When I'm with you, it just happens.

تەنیا بۆ یەك جار لە ژیانم دا پێویستم بەوە نیە هەوڵ بدەم بۆ ئەوەی خۆشحاڵ بم. کاتێ لەگەڵ تۆم یەکسەر خۆشحاڵ دەبم.

"نەزانراو"

"Just keep smiling and pretending you're happy, and then maybe after you've convinced everyone else that you are, you can convince yourself"

پێبکەنەو خۆت وا نیشاندە کە تۆ بەختەوەری، ڕەنگە دوای ئەوەی بڕوات بە هەموو کەس هێنا کە تۆ بەختەوەری، بتوانی بڕوا بە خۆشت بێنی.

"نەزانراو"

Smart people know their strengths, but happy people are the ones who have accepted their flaws.

مرۆڤــە زیرەکــەکان هێــزی خۆیــان دەزانــن, بــەڵام بەختەوەرەکان ئەوانەن کە نەنگیەکانی خۆیان قبوڵە.

"کیمۆ"

Happiness is when what you think, what you say and what you do are in harmony.

بەختــەوەری ئــەو کاتەیــە کــە تــۆ بیرکردنــەوەو قــسەو کردارت وەك یەك بێت.

"غاندی"

Happiness is not an absence of problems; but the
ability to deal with them.

بەختەوەری مانای نەبوونی کێشە نیە , بەڵکو توانای خۆ گونجاندنە لەگەڵ کێشەکان.

"جاکسۆن براون"

You have to be sad sometimes, because if you aren't you forget how wonderful it is to be happy.

هەندێ کات پێویستە خەمباربیت, بۆ ئەوەی بیرت نەچێت کە بەختەوەری چەندە خۆشە .

"نەزانراو"

The best way to cheer yourself up is to try to cheer somebody else up.

باشترین رێگا بۆ دڵخۆش کردنی خۆت دڵخۆشکردنی کەسێکی ترە.

"مارك تواين"

The only way to avoid being miserable is not to have enough leisure to wonder whether you are happy or not.

تەنها رێگا بۆ ئەوەی دوورکەویەوە لە دڵتەنگی بوونی کاتی بەتاڵ نیە بۆ ئەوەی بزانی کە تۆ دڵخۆشی یان نا.

"بێرنارد شۆ"

People don't notice whether it's winter or summer when they're happy.

کاتێ خەڵك دڵخۆشن تێبینی ئەوە ناکەن هاوینە یاخود زستان.

"ئەنتۆنی چیخۆف"

Happiness is when what you think, what you say, and what you do are in harmony.

بەختەوەری ئەو کاتەیە کە پێتوایە ئەوەی دەیکەیی و ئەوەی دەیلێی گونجاوە.

"غاندی"

When a man has lost all happiness, he's not alive. Call him a breathing corpse.

کاتێ مرۆڤ تەواوی بەختەوەری ون دەکات, ئەوا چیتر نـاژی, به جەستەیەکی مردوو بانگی بکە کە هەناسە دەدات.

"سۆفۆکلیس"

To be stupid, selfish, and have good health are three requirements for happiness, though if stupidity is lacking, all is lost.

گەمـژەیی و خۆپەرسـتی و تەندروسـتیەکی بـاش, سـێ پێویـستی بەختـەوەربونن, لـە کاتێکـا ئەگـەر گەمـژەیی کەم بوو ئەوا هیچی بوونی نیە.

"گوستاڤ فلۆبێرت"

Happiness depends upon ourselves.

بەختەوەری لەسەر خۆمان وەستاوە.

"ئەریستۆتاڵ"

Happiness: a good bank account, a good cook and a good digestion.

بەختەوەری: حسابێکی بانکی باش, خواردنێکی باش و هەرس کردنێکی باش.

"ژان ژاك رۆسۆ"

The most happy the one who made the most people happy."

دڵخۆشترین کەسەکان ئەوانەن کە زۆرترین کەس دڵخۆش دەکەن.

"مارکس"

Happiness is the meaning and the purpose of life, the whole end and human existence.

بەختەوەری مانـاو مەبەستی ژیان و کۆتـایی و بـوونی ئادەمیزادە.

"ئەریستۆتاڵ"

Thousands of candles can be lit from a single candle, and the life of the candles will be not shortened, happiness never decreases by being shared.

هەزاران مۆم بەهۆی یەك مۆمەوە دادەگیرسێ, تەمەنی ئەو مۆمەش کەم ناکاتەوە, بەختەوەری کەم ناکات بە بەشدار پێکردنی کەسانی تر.

"بودا"

Nothing can bring you happiness but yourself.

هیچ شتێك ناتوانێ بەختەوەریت بۆ بێنێ، تەنیا خۆت نەبی.

"ئیمیرسۆن"

To be happy with a man you must understand him a lot and love him a little. To be happy with a woman you must love her a lot and not try to understand her at all.

بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاو دڵخۆش بی دەبێ زۆر لێی تێبگەیی و کەم خۆشتبوێت. بۆ ئەوەی لەگەڵ ئافرەت دڵخۆش بی دەبێ زۆرت خۆشبوێت و بە هیچ شێوەیەکیش هەوڵ مەدە لێی تێبگەیی.

"هێلین راولاند"

Everyone smiles in the same language.

هەموو مرۆڤەکان بە یەك زمان پێدەکەنن.

"نەزانراو"

Happiness will never come to those who fail to appreciate what they already have.

بەختەوەری هەرگیز بۆ ئەو کەسانە نایەت کە سوپاسگوزار نین لە هەمبەر ئەو شتانەی کە هەیانە.

"نەزانراو"

Happiness sneaks through a door you didn't know you left open.

بەختەوەری بە دزیەوە لەو دەرگایە دێتە ژوورێ کە نەتدەزانی بە کراوەیی جێت هێشتووە.

"جۆن باری مۆر"

Success is not the key to happiness. Happiness is the key to success. If you love what you are doing, you will be successful.

سەرکەوتن کلیلی بەختەوەری نیە. بەختەوەری کلیلی سەرکەوتنە. ئەگەر ئەو کارەت خۆش بوێت کە دەیکەی ئەوا سەرکەوتوو دەبیت.

"هێرمان کەین"

Today I'm happy because I realized how lucky I am for everything that I have. Today I am happy because I don't have any reason not to be.

ئەمرۆ بەختەوەرم چونکە بۆم دەرکەوت بە بەختم بۆ ئەو شتانەی کە هەمە. ئەمرۆ بەختەوەرم چونکە هیچ هۆکارێك نیە لە بەختەوەرەریم دوورخاتەوە.

"نەزانراو"

If someone does not smile at you, be generous and offer your own smile. Nobody needs more a smile than the one that cannot smile to others.

ئەگـەر كەسـێك بـەڕووت دا پێنەكـەنی، میهرەبـان بـە لەگـەڵی و بـەڕووی دا پێبكەنـە. هـیچ كـەس زیـاتر لـەو كەسە پێویستی بـە پێكـەنین نیـە كـە نـاتوانێ بـەڕووی كەسانی تردا پێبكەنێ.

"نەزانراو"

'Happiness is like the rainbow - it comes suddenly, and before you can enjoy it - it disappears'...

بەختەوەری وەك پەلكە زێڕینە وایە – لـە ناكـاو دێـت و بەر لەوەی خۆشی لێ ببینی ون دەبێت.

"نەزانراو"

Success is not the key to happiness. Happiness is the key to success. If you love what you are doing, you will be successful.

سەرکەوتن کلیلی بەختەوەری نیە. بەختەوەری کلیلی سەرکەوتنە. ئەگەر ئەو کارەت خۆش بوێت کە دەیکەی ئەوا سەرکەوتوو دەبیت.

"هێرمان کەین"

Today I'm happy because I realized how lucky I am for everything that I have. Today I am happy because I don't have any reason not to be.

ئەمڕۆ بەختەوەرم چونکە بۆم دەرکەوت بە بەختم بۆ ئەو شتانەی کە هەمە. ئەمڕۆ بەختەوەرم چونکە هیچ هۆکارێك نیە لە بەختەوەرەریم دووربخاتەوە.

"نەزانراو"

Happiness is not a mood... it’s a Decision

بەختەوەری میزاج نیە بەڵکو بریاردانە.

"نەزانراو"

Worry doesn't help tomorrow's troubles, but it does ruin today's happiness.

دڵتەنگی یارمەتی کێشەکانی بەیانیت نادات, بەلاّم بەختەوەری ئەمڕۆت لە ناوئەبا .

"نەزانراو"

Happiness is in your hand. It's your choice whether you want to use it or not.

بەختەوەری لە ناو دەستی خۆتە. هەڵبژاردنی خۆتە کە ئایا دەتەوێ یاخود نا.

"ویلسۆن کەنەدی"

Just because you can't see it doesn't mean it isn't there. You can't see the future, yet you know it will come; you can't see the air, yet you continue to breathe.

تەنیا لەبەر ئەوەی نایبینی مانای ئەوە نیە کە بوونی نیە. ناتوانی داهاتوو ببینی لە کاتێکدا دەزانی کە دێت, ناتوانی هەوا ببینی لە کاتێکدا بەردەوامی لە هەناسەدان.

"کلێر لەندەن"

First have faith in those around you, but most importantly always have faith in yourself!

سەرەتا متمانەت بەو شتانە هەبێت کە لە دەورتە, بەلاَم لە هەمووی گرنگتر متمانەت بەخۆت هەبێت.

"نەزانراو"

"I don't pray for God to take my problems away, I pray only for God to give me the strength to go through them."

دوعای ئەوە ناکەم خوا کێشەم لێ دووربخاتەوە، تەنیا دوعای ئەوە دەکەم کە هێزی ئەوەم پێ ببەخشێ لەگەڵ کێشەکان برۆم.

"نەزانراو"

if you believe in something don't let anyone take it away from you don't let anyone put you down about it. Follow your dream until you have achieved it.

گەر باوەڕت بە شتێك هەبوو ڕێگە بە هیچ کەس نەدەی لێتی دووربخاتەوە، بە دوای خەونەکانت بکەوە تا ئەو کاتەی دەیکەی بە راستی.

"ئەیمی بلەنت"

Seeing is believing, but sometimes the most real things in the world are the things we can't see.

بینین باوەڕە, بەڵام هەندێ جار راستترین شتەکان لە جیهان ئەو شتانەن کە ناتوانین بیانبینین.

"نەزانراو"

When I was a little girl, no one called me beautiful. Every girl should be called beautiful, even if she's not.

کاتێ کە کچێکی بچوك بووم, هیچ کەس پێی نەگوتم جوانی. هەموو کچێك پێویستی بەوەیە پێی بگوترێ جوانی هەتا ئەگەر جوانیش نەبێت.

"مارلین مۆنرۆ"

Trust God, because only he holds the key to your future.

باوەڕت بە خودا بێت, چونکە تەنیا ئەو کلیلی داهاتووی پێیە.

"ليندز"

Humor comes from self-confidence.

گاڵتەو گەپ لە متمانە بەخۆبوونەوە دێت.

"پيتا براون"

Hope is hearing the melody of the future. Faith is to dance to it.

هیوا گوێ بیستبوونی گۆرانی داهاتووە. متمانە سەما کردنە لەگەڵی.

"نەزانراو"

Who has confidence in himself will gain the confidence of others.

ئەو کەسەی متمانەی بە خۆیەتی متمانەی کەسانی تریش بەدەست دێنێ.

"لازارۆ"

If you doubt yourself, then indeed you stand on shaky ground.

گەر گومانت لە خۆت هەیە, مانای وایە تۆ لەسەر زەویەکی لەرزۆك وەستاوی.

"هێنریك ئیبسین"

One important key to success is self-confidence.

یەکێك لە گرنگترین کلیلەکانی سەرکەوتن متمانە بەخۆبوونە.

"ئارسەر ئاشی"

Anyone who ever gave you confidence, you owe them a lot.

هەرکەسێك متمانەی پێبەخشیوی ئەوا زۆری قەرزاری ئەوی.

"ترومان کاپۆت"

All of us have wonders hidden in our breasts, only needing circumstances to evoke them

هەموومان ئارەزوی شاراوەمان لە ژێر سینەمان هەیە, تەنیا پێویستی بە بارودۆخێکی گونجاوە بۆ دەرخستنی.

"چارلس دێکنز"

Plant your own garden and decorate your own soul, instead of waiting for someone to bring you flowers.

باخچەی خۆت گوڵڕێژ بکەو رۆحت برازێنەوە لە بری ئەوەی چاوەڕێی کەسێك بکەی بۆ ئەوەی گوڵت بۆ بێنێ.

"ڤیرۆنیکا شۆفستاڵ"

When there is no enemy within, the enemies outside cannot hurt you.

کاتێ لە ناخەوە دوژمنت نەبێت دوژمنی دەرەوە ناتوانێ ئازارت بدت.

"پەندێکی ئەفریقی"

Nobody can make you feel inferior without your consent.

هیچ کەسێك ناتوانێ وات لێبکات هەست بە کەمی بکەیت بێ رەزامەندی خۆت.

"ئیلینۆر روسوفێلت"

We have to learn to be our own best friends because we fall too easily into the trap of being our own worst enemies.

دەبێ فێری ئەوە بین ببین بە باشترین هاوڕێی خۆمان چونکە زۆر بە ئاسانی دەکەوینە ناو تەڵەی بوون بە خراپترین دوژمنی خۆمان.

"ڕۆدریك سۆرپ"

Don't you ever think that we are strong enough to face our problem We are weak and fragile and absolutely we need GOD.

هەرگیز وا بیر نەکەیەوە کە تەواو بەهێزی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان. ئێمە بێ هێزو شکست خواردوین و بێگومان پێویستمان بە خودایە.

"نەزانراو"

You can do what you have to do, and sometimes you can do it even better than you think you can.

دەتوانی ئەوە بکەی کە دەتەوێت, وە هەندێ کاتیش دەتوانی باشتر لەوە بکەی کە بیری لێدەکەیەوە.

"نەزانراو"

It took me a long time not to judge myself through someone else's eyes."

کاتێکی زۆری ویست تا له چاوی کەسانی ترەوە خۆم هەڵنەسەنگێنم.

"سالی فیلد"

Ponder on this:
"If you think something is true about someone just because everyone else believes it, then you are not thinking!"

لەوە ڕابمێنە:

"ئەگەر وا بزانی شتێك ڕاستە تەنیا لەبەر ئەوەی کەسانی تر لەو باوەڕەدان, کەوایە تۆ بیر ناکەیەوە"

"نەزانراو"

You look behind you and regret...
You look before you and worry...
Look ABOVE and have FAITH!!

سەیری دواوە دەکەیی و پەشیمانی...

سەیری پێشەوە دەکەیی و پەرێشانی...

سەیری سەرەوە بکەو متمانەت هەبێ...

"نەزانراو"

Worry looks around, Sorry looks back, and Faith looks up.

مرۆڤـی پەرێـشان سـەیری دەوروبـەر دەکـات, مرۆڤـی چـارەڕەش سـەیری دواوە دەکـات, مرۆڤـی بـە متمانـە سەیری سەرەوە دەکات.

"نەزانراو"

Watch your dreams, sometimes they come true.

چاودێری خەونەکانت بکە, هەندێ جار دەبن بە ڕاستی.

"نەزانراو"

Always begin with believing.

هەموو کات بە باوەڕەوە دەست پێبکە.

"نەزانراو"

Everything happens for a reason, we just have to accept the truth without losing our faith!

لە پشت هەر ڕووداوێك هۆكارێك هەیە, تەنیا پێویستە ڕاستیەكان قبوڵ بكەین بەبێ ئەوەی متمانە لەدەست بدەین.

"نەزانراو"

God opens millions of flowers, without forcing the buds. It reminds us not to force anything, for things happen in the right time.

خودا ملیۆنان گوڵ دەکاتەوە، بێ ئەوەی خونچەکان ناچار بکات. ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە هیچ شتێك ناچار نەکەین، چونکە شتەکان لە کاتی خۆی ڕوودەدەن.

"نەزانراو"

Everything Happens for a Reason.. But it takes some time to know it!!

لە پشت هەر ڕووداوێك هۆکارێك هەیە... تەنیا هەندێ کاتی دەوێ تا بیزانین.

"نەزانراو"

Our character is what we do when we think no one is looking.

کەسایەتی ئێمە لەو کارانە ڕەنگدەداتەوە کە دەیکەین کاتێ هیچ کەس نامانبینێت.

"نەزانراو"

Appear weak when you are strong and strong when you are weak.

بێ هێز خۆت دەرخە کاتێ بە هێزی و بەهێز خۆت دەرخە کاتێ بێ هێزی.

"نەزانراو"

Knowledge speaks, but wisdom listens.

زیرەك قسە دەکات بەڵام زانا گوێ دەگرێ.

"جیمی هنریکس"

A word of encouragement during a failure is worth more than an hour of praise after success...

یەك وشەی هاندەر لە كاتی شكست(دۆران) دا زۆر بە نرخترە لە یەك كاتژمێر پێدا هەڵگوتن لە كاتی سەركەوتندا.

"نەزانراو"

The truest wisdom is a resolute determination.

ڕاسترین زانایی سوور بوونە لەسەر بڕیاردان.

"ناپلیۆن بۆناپەرت"

There is wisdom of the head, and wisdom of the heart.

زانایی عەقڵ هەیە و زانایی دڵیش هەیە.

"چارڵز دیکنز"

Wisdom is not wisdom when it is derived from books alone.

ئەو زانابییە زانایی نیە کە تەنیا لە کتێبەکانەوە وەربگیرێت.

"هۆرەیس"

Wisdom is the supreme part of happiness.

زانایی بەرزترین بەشی بەختەوەریە.

"سۆفۆكليس"

Wisdom, compassion, and courage are the three universally recognized moral qualities of men.

زانـایی و بـەزەیی و ئازایـەتی سـێ خاسـیەتی ناسـراوی

جیهانی ئەخلاقیەتی پیاون.

"كۆنفۆشیۆس"

A child can ask questions that a wise man cannot answer.

منداڵ پرسیاری وا دەکات کە زانا ناتوانی وەڵام داتەوە.

"نەزانراو"

The art of being wise is the art of knowing what to overlook

هونەری ژیربوون بریتیە لە زانینی چۆنیەتی چاوپۆشی کردن.

"ویلیەم جەیمس"

Good people are good because they've come wisdom through failure.

مرۆڤە باشەکان باشن چونکە لە رێگەی شکستەکانیەوە ژیریان بەدەست هێناوە.

"ویلیام سۆرۆیان"

The fool doth think he is wise, but the wise man knows himself to be a fool.

مرۆڤی گەمژە خۆی پێ زانایە بەڵام مرۆڤی زانا خۆی بە گەمژە پیشان دەدات.

"شکسپیر"

A wise person knows that there is something to be learned from everyone...

مرۆڤی زانا دەزانێت کە دەبێت لە هەرکەسێکەوە شتێك فێربێت.

"نەزانراو"

"You can tell whether a man is clever by his answers. You can tell whether a man is wise by his questions."

مرۆڤی زیرەك لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دەردەکەوێت, بەڵام مرۆڤی زانا لە ڕێگەی ئەو پرسیارانەی کە دەیکات دەردەکەوێت.

"نەزانراو"

Honesty is the first chapter in the book of wisdom.

ڕاستگۆیی بەشی یەکەمی کتێبی زانابیە.

"تۆماس جیفرسۆن"

Some people think before they speak. Some people speak before they think. But the smart ones just smile and nod...

هەندێ خەڵك بیر دەکەنەوە بەر لەوەی قسە بکەن.

هەندێ خەڵك قسە دەکەن بەر لەوەی بیر بکەنەوە.

بەلاَم مرۆڤی ئاقڵ تەنیا زەردەخەنە دەکات و سەر دەلەقێنێ.

"نەزانراو"

The doors of wisdom are never shut.

دەرگای زانایی هەرگیز داناخرێت.

"بێنجامین فرانكلین"

The older I grow the more I distrust the familiar doctrine that age brings wisdom.

چەندی بەرەو تەمەن دەڕۆم ئەوەندە زیاتر نادروستی ئەو بیروباوەڕە ناسراوەم بۆ دەردەكەوێت كە گوایە تەمەن زانایی دێنێ.

"مێنكن"

The only true wisdom is in knowing you know nothing.

زاناترین کەس ئەو کەسەیە دەزانێت کە نازانێت.

"سوقرات"

Two people can damage a society: the one who knows and doesn't talk and the one who doesn't know and talks...

دوو جۆر مرۆڤ کۆمەڵگە تێکدەدەن: کەسێك کە دەزانێ و قسە ناکات, وە کەسێك کە نازانێ و قسە دەکات.

"نەزانراو"

Don't let someone create you, because they might just destroy you...

ڕێگە بە هیچ کەس نەدەی تۆ دروست بکات, چونکە لەوانەشە تێکتبشکێنن.

"نەزانراو"

The secret of creativity is knowing how to hide your sources...

نهێنی داهێنەر ئەوەیە کە بزانی چۆن سەرچاوەکانت دەشاریتەوە.

"ئەنیشتاین"

"To know that you know and to know that you don't know - that is real wisdom."

زانینی ئەوەی کە دەیزانی و زانینی ئـەوەی کـە نـایزانی زانایی راستەقینەیە.

"کۆنفۆشیۆس"

There is no gain without pain.

هـیچ شـتێك بـە دەسـت نایـەت بـێ ئـەوەی ئـازاری بـۆ بچێژی.

"پەندێکی ئینگلیزی"

Rather fail with honor than succeed by fraud.

شکستێك به سه‌ربه‌رزی باشتره له سه‌رکه‌وتنێك به فێـڵ و تاوان.

"نه‌زانراو"

Knowing others is wisdom, knowing yourself is Enlightenment...

ناسینی که‌سانی تر زانایيه, ناسینی خۆت ڕۆشنایيه.

"نه‌زانراو"

Most people are stronger than they know. They just forget to believe in it sometimes...

زۆربەی خەڵك بەهێزترن لەوەی کە دەیزانن. تەنیا زۆر کات لە بیر دەکەن بڕوایان بەمە هەبێت.

"نەزانراو"

Fear is what stops you... Courage is what keeps you going...

ترس ئەو شتەیە کە دەتوەستێنێ... ئازایەتی ئەو شتەیە کە بەرەو پێشت دەبات.

"نەزانراو"

I complained because I didn't have shoes until I saw someone without feet.

گلـەیی ئـەوەم دەکـرد کـە پـێڵاوم نیـە تـا ئـەو کاتـەی کەسێکم بینی کە قاچی نەبوو.

"دیل کارنگی"

Broken wings are not useless, because they still hold the memories of being able to fly.

باڵـە شـکاوەکان بـێ سـوود نـین، چـونکە هێـشتا ئـەو بیرەوەریانەی هەڵگرتووە کە دەتوانێت پێی بفڕێت.

"نەزانراو"

To understand the heart and mind of a person, look not at what he has already achieved, but at what he aspires to.

بۆ تێگەیشتن لە بیرو دڵی هەر کەسێك, سەیری ئەوە مەکە کە چی بەدەست هێناوە, بەڵکو سەیری ئەوە بکە کە دەیەوێ بە دەستی بێنێ.

"جبران خلیل جبران"

The difference between a successful person and other is not a lack of strength, not a lack of knowledge, but rather in a lack of will...

جیاوازی نێوان مرۆڤی سەرکەوتوو خەڵکانی تر, نەبوونی هێز یان زانیاری نیە, بەڵکو کەمی ئیرادەیە.

"نەزانراو"

It is not whether you get knocked down; it is weather you get up...

گرنگ ئەوە نیە کە کەوتی گرنگ ئەوەیە هەڵسیتەوە.

"لینین"

A fool will learn nothing from a wise man, but a wise man will learn much from a fool...

مرۆڤی گەمژە هیچ شتێك لە زانا فێرنابێت, بەڵام مرۆڤـی زانا زۆر شت لە مرۆڤی گەمژە فێر دەبێت.

"نەزانراو"

کاتێ ژیان سەد هۆکارت دەداتێ بۆ گریان، هەزار
هۆکار نیشانی ژیان بدە بۆ پێکەنین.

نەزانین هێندەی ئەوە شەرم و عەیب نییە کە
ویستی فێربوونمان نەبێت .

هەرگیز هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێک مەکە کە
رقی لە دایکیەتی، چونکە لە کۆتاییدا رقی
لە تۆش دەبێتەوە.

خۆشەویستی یەکەم تا رادەیەک بێ عەقڵییە، بەڵام
دونیایەکە لە مەراق.

ئێمە کە عومر بە کەم ئەژمێرین ، حەیف نییە
ئەویش بە ترس رابوێرین.




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر
نرخی ٣٥٠٠ دینار